رۆمان

# ئەو پیاوەی کە
# سێبەری خۆی فرۆشت

# یان

# سەربهوردە سەیرەکەی
# پیتەر شلمیل

ن: ئادلبرت ڤۆن شامیسو
و: حەمەکەریم عارف
2011/10/23

**ناوی کتێب: ئەو پیاوەی کە سێبەری خۆی فرۆشت**

**بابەت: ڕۆمان**

**نووسینی: ئادلبرت ڤۆن شامسێو**

**وەرگێڕانی: حەمەکەریم عارف**

**پیتچنین: رزگار حەساری**

**هەڵەچن:گۆڤەند محەمەد**

**چاپخانەی:یاد**

**مۆنتاژ و بەرگ: یانەی قەڵەم**

**بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**

**چاپی یەکەم** 2012

# ئادلبیرت ڤۆن شامیسۆ
# (1838-1781)

ئادلبیرت ڤۆن شامیسۆ، ناوی خوازراوی شاعیری بە ناوبانگ لویس شارل ئیدیلایید دی شامیسۆیە. بەرەگەز ئەلمانییە، لە دایکبووی فەرەنسایە.بابی ئەفسەر بوو، لە بنەماڵە و ماڵباتێکی خانەدانی ناوچەی لۆرین بوو. لە ساڵی 1804ـــــەوە ناوی (ئادلبیرت) ی بۆ خۆی هەڵبژارد. لە فەرەنسادا بە ئەڵمانیان دەزانی و لە ئەڵمانیادا بە فەرەنسی، لە نێو پرۆتستانەکاندا بە کاتۆلیکیان دەزانی و لە نێو کاتۆلیکەکاندا بە پرۆتستانت. لە ناو ئەرستۆکراتەکاندا بە دیموکرات و یاخی و لە ناو دیموکراتەکاندا بە ئەرستۆکرات دەزانرا..یانی لە هیچ شوێنێکدا جێگای نەبوو و،لە گشت جێگەیەکیشدا نامۆ و بێگانە بوو. خۆی گوتەنی جیَ پێی ئەو وەکو ئەو جیَ پێیەی ناو بەفرە کە شەویَ بەفری تازەی بەسەردا باری بێت . واتا پڕبووبێتەوەو دیار نەمابێت..واتە خەڵکی مەملەکەتی غوربەت بوو ، خۆی گوتەنی : ***" لەوێندەر خاك لێم نەبان و نامۆیە. لێرە خەڵك و خوا لێم نەبان و نامۆن، بۆیە غەمی غوربەتی من دەرمانی نییە."***

شامیسۆ، هەرچەندە پسپۆڕ و زانای بواری رووەکناسی بوو، بەڵام یەکێك بوو لە شاعیرە خۆشەویست و ناودارەکانی سەردەمی خۆی. زۆر شیعری سیاسی توند و رەخنەئامێزی نووسیوەو، زیاتر لە بزوتنەوەی (ئەڵمانیای لاو) نزیك بووە. ماڵباتەکەیان لە سەردەمی هەراو هەنگامەی شۆڕشی فەرەنسادا بۆ باشووری ئەڵمانیا باردەکەن و پاشان لە بەرلین جێگیر و ئاکنجی دەبن. لەوێندەر لە کارگەیەکی گۆزەگەریدا کاری نیگارکێشی دەکات. پاشان لە دەرباری شاژنە (فریدریکا لویزا)دا گیرسایەوە. دوایی بوو بە ئەفسەر لە سوپای پروسیدا. لە ساڵی 1803دا پەیوەندی بە ( کۆمەڵەی ئەستێرەی باکوور)ـەوە کرد کە یانە و پاتۆقی شاعیرە رۆمانسییەکان بوو. دوای ئەوە کەوتە نووسین بە زمانی ئەڵمانی، و زمانی یۆنانی خوێند، و بەشداری لە وەرزەنامەیەکی شیعریدا کرد بە ناوی ( خواوەندانی شیعر) پاش ئەوەی ماوەیەکی لە زاگە و زێدی خۆی و دواتر لە پاریس بەسەربرد، گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا و دەسبەرداری ژیانی سوپایی بوو، و ئیدی لە نێوان ئەڵمانیاو فەرەنسادا لە هاتوچۆدا بوو.

پەیوەندی شامیسۆ دەگەڵ ئەدیبانی سەردەمی خۆیدا بتەو بوو، هاتوچۆی ئەنجوومەنە ئەدەبییەکانی دەکردن، هاوکاری دەگەڵ دەکردن..پاشان بە تەواوەتی ڕووی کردە لێکۆڵینەوە، لە بەرلیندا کەوتە خوێندنی دکتۆری و پاشان رووەکناسی. لە ساڵانی( 1815-1818)دا بەشداری لە گەشتێکی دەریاوانی بە دەوری دنیادا، کرد و کتێبێکی لە ژێر سەرناڤی ( گەشتێك بە دەوری دنیادا لە نێوان ساڵانی 1815- 1818) نووسی و بە چاپی گەیاند. پاشان دکتۆرانامەی فەخری

وەرگرت، ئەوجا بە ئەمینداری باخچەی ڕووەکانی بەرلین دامەزرا، پاشتر بوو بە ئەندامی کۆڕی زانیاری.

شامیسۆ، لە هەوەڵەوە شیعری بە فەرەنسی دەنووسی و پاشان بە ئەڵمانی. بە ڕۆمانسییەت دەستی پێکرد و بەرەو ریالیزم دایکێشا. شیعرەکانی بابەتی هەمەجۆریان لە خۆ گرتووە..هەندێ لە کار و بەرهەمەکانی بریتین لە : "کۆشکی بۆنکۆرت-1827، دوورخراوەکان-1830، ئەفسانانی ئەڵمانی، ڤیانی ژنان و ژیانیان، شانۆنامەی: هەنبانەکەی فۆرتۆناتۆس وکڵاوی سەخری جن، و شیفای عەجیب"..بەڵام بە ناوبانگترین بەرهەمی کە شۆرەتی عالەمگیری پێبەخشی رۆمانی (سەربهووردە سەیرەکەی پیتر شلمیل یان ئەو پیاوەی کە سێبەری خۆی فرۆشت)ــــە باسی پیاوێك دەکات کە سێبەرەکەی خۆی فرۆشتووە.

***شامیسۆ، نووسەرو ڕووەکناسی بەناوبانگی ئەڵمانی ، یەکێك بووە لە نوێنەرانی دیارو بەرجەستەی بزوتنەوەی ڕۆمانتیزمی ئەڵمانی. ( ئەو پیاوەی کە سێبەری خۆی فرۆشت) بەناوبانگترین بەرهەمیەتی..دیارە زۆر نووسەری دیکەی پێش شامیسۆ ویستویانە تیمەو بابەتی ئەم ڕۆمانە کە ئەفسانەیەکی باوی سەدەکانی ناڤین بووە بە ناونیشانی ( هەنبانەکەی فورتۆناتۆس) بکەن بە هەوێنی بەرهەمەکانیان..گوایە ئەم هەنبانەیە پڕبووە لە زێڕو چەندی زێڕ لێدەرهێنرابێ هەر لە بن نەهاتووەو تەواو نەبووە..جا شامیۆ، ئەم ئەفسانەیەی کردووە بە هەوێنی ڕۆمانەکەی و بە زمانی رەمز و ئەفراندن، هەندێ لایەنی کەسایەتی و ژیان و تایبەتمەندیە ڕۆحی و دەروونییەکانی خۆی و هزرین و باوەڕی خۆی دەربڕیوە، ڕۆمانێکە کە زۆر ڕاڤەو شرۆڤە هەڵدەگرێت و، بە ئاسانی خۆی بە دەستەوە نادات..و بۆ زۆر زمانی زندووی جیهان پاچڤە کراوەو وا بە درەنگەوە زمانی کوردیشی هاتە پاڵ..***

( شلمیل)ی شا قارەمانی ڕۆمانەکە تووشی پووچی و بێهوودەیی دنیایەك بووە کە پێدەچێ لەو دنیایەدا دارایی و دەوڵەمەندی دەرمانی گشت دەردان بێت..هەڵدەستێت سێبەرەکەی بە سەروەت و سامانێکی بێ کۆتایی دەفرۆشێت.بەڵام لەگەڵ فرۆشتنی سێبەرەکەیدا گیرۆدەو گرفتاری هەزار و یەك کێشەوگرفت دەبێت، ڕوو دەکاتە هەر شوێنێك وەدەردەنرێت، لە گشت لایەك بێگانەو نامۆ دەبێت، کەس نایگرێتە خۆی، نە لە خاکێکدا ئۆقرە دەگرێت و دەهێوریێ و نە لە ناو خەڵکێکدا دەحەوێتەوە، ئیدی تەنیای تەنیا دەمێنێتەوە، بۆیە بە پەرۆشەوە دەکەوێتە هەوڵی کڕینەوەو وەدەستهێنانەوەی سێبەرەکەی. بەڵام هەرچییەك دەکات بەو ئاواتەی ناگات، و بە ناچاری کارەساتی تەنیایی دەجەڕبێنێ و وێڵ و سەرگەردان، پەشێو و پەریشان، بە عەزرەتی وابەسەگییەوە دەتلێتەوە. مەحکوومە بە تەنیایی، بە بێواری ، بە بێ ڕیشەیی و بەوەی سەنگی خۆی لە دەستداوە. ( ***شلمیل، بە مانای بەدووم ، دومۆر، شووم ، نەگبەت، نەحس دێت.)*** و خۆی بە خنکاوێك دەشوبهێنێت کە شەپۆلان هەڵیاندابێتە کەناری دوڕگەیەکی سەرسەوز و گوم بووبێ..

بەهەرحاڵ قارەمانی ڕۆمانەکە هەوڵدەدات بە دەستێك دوو کاڵەکان هەڵگرێت، کە نەك ئەمەی پێناکرێت، بەڵکو هەموو شتێك لە دەست دەدات، بەدبەخت دەبێت!. شامیسۆ، لەم ڕۆمانەدا

وەکو هەندێ لە نووسینەکانی تری باسی ئەو مەینەتیانە دەکات کە تووشی بوون، بەلاَم مامەڵەیەکی هونەریانەی دەگەڵدا کردوون ، وخستوونیەتێ سەر باڵی خەون و خەیاڵ و واقیع و خەیاڵ بە جۆرێ ئاوێتەی یەکتر بوون، کە لێك هەلاَوێردانیان ئەگەر مەحاڵیش نەبێت یەجگار ئەستەمە. بۆیە دەتوانرێ بگوترێ کە شلمیل لەم ڕۆمانە هونەرییە نایابەدا هەم شامیسۆیە و هەم شامیسۆ نییە.

شامیسۆ، توانی بەم ڕۆمانە شاکارێکی ئەدەبی ئەوتۆ بەرهەمبێنێت کە لە لایەکەوە زۆر زوو پاچڤەی زۆربەی زمانانی زندووی دنیا کراو لە لایەکی ترەوە ئەفسانەو رەمزێکی ئەفراند وداهێنا کە تا حەزبکەی ڕاڤەو شرۆڤە هەڵدەگرێت و ئەوجاش بە ئاسانی خۆی بە دەستەوە نادات.

بەهەرحاڵ ڕەنگە شامیسۆ لەلای خوێنەری کورد ناوێکی ناسراو نەبێت، ئەمە یەکەم بەرهەمی ئەو ئەدیب و زانایە بێت بە زمانی کوردی، بەلاَم با خوێنەرانمان ئەوە بزانن کە ئەمە شاکاری ئەوە، لە ناو قەومی خۆیدا و لە دنیای ئەدەبیاتدا نووسەرێکی بەقەدر و بە ناوبانگە..شامیسۆ لە 1838/8/21دا لە بەرلین کۆچی دوایی کرد و ئەستێرەی ژیانی ئاوابوو، بەلاَم تا ئیستاش ئەستێرەیەکی درەوشاوەیە لە ئاسمانی ئەدەبیاتی جیهاندا..و لە ئەڵمانیادا خەلاَتێکی ئەدەبی بە ناوبانگ بە ناوی ئەوەوە هەیە ، کە دەدرێت بەو نووسەرە بیانیانەی کە بەرهەمەکانیان بە زمانی ئەڵمانی دەنووسن، ئەی مانای چی! خەڵکی ئاوا بە تەنگی زمانی خۆیانەوەن..

((1))

سـەرەنجام، دوای سـەفەرێکی دەریـایی خـۆش کـە هـەر چـەندە زۆری مانـدوو کـردم، گەییـنـە بەندەر. هـەر کـە لـە کەشتییەکە دابـەزیمو پێم گەییـە سـەر وشکایی، بـەخۆم باروبنـە ناچیزەکەم هەڵگرت،و درِم بە ریزی خەڵکەکەداو خۆم بـە یەکـەم خانوودا کـرد کـە تابلۆیـەکی بـێ نموودو بـێ دیمـەن بەسـەر دەرگاکەیـەوە هەڵواسـرا بـوو. داوای ژوورێکـی نووسـتنم کـرد: پێشـخزمەتەکە نیگایەکی سەراپای کردمو بۆ ژوورێکی ژێر شیروانیەکەی بردم. داوام کرد کە ئاوێکی ساردم بۆ بێنیٚو نشیمەنی جەنابی (توماس یون)م بە دروستی پیٚ نیشانبدات.

گوتی:

*"بەرانبەر بە دەروازەی باکوور، ڤیلای یەکـەمی دەستە ڕاست، خانوویـەکی گـەورەو نـوێی بـە مەرمەڕی سوورِوسپی، بە کۆمەڵێك پایەو ئەستوونی زۆرەوە"*

– باشە.

بەیانی زوو بوو، بە پەلە بوخچەکەم کردەوە، جلە ڕەشەکانم کە تازە بەرەو پشت بوو بوو، لـیٚ دەرهێنـا،و بـە جـوانترین شـێوە لەبـەرم کـردن، ئـەو راسـپارنامەیەکم لەگـەڵ خـۆ هێنابوو،راسـپارنامەکەم هـەڵگرتو بـەرەو لای ئـەو پیـاوە وەرێکـەوتم کـە قـەرار بـوو، لـە جێبەجێکردنی هەندیٚ وردە کاران دا یارمەتیم بدات.

بە شـەقامە درێژەکـەی باکووردا هـەوراز بوومـەوەو گەییمـە دەروازەکـە، زۆری پێنەچوو گرشە گرشی دارو درەختە سەوزەکانم بینی. لە دڵی خۆدا گوتم: "کەواتە ئێرەیە"

بـە دەستەسرِەکەم گـەردوتۆزی سـەر پێڵاوەکـانم سـرِی، بۆینباخەکـەم رێکخسـت، نـاوی خـوام لێهێنـاو دەسـتم بـۆ پـەتی زەنگـی دەرگاکـە بـرد. دەرگـا کرایـەوە. لـە ڕاڕەوو داڵانەکـەدا سیٖنو جیم بـەرۆکی گـرتم. پاشـان دەرگاوانەکـە هـەواڵی هـاتنی مـنی راگەیانـد،و شـەرەفی ئـەوەم پێبرِا کـە بـۆ باغستانی ماڵەکە خوڵك کرام. جەنابی (یۆن) لەگەڵ چەند کەسێکدا، لەوێنـدەر سـەرگەرمی پیاسـە بوو. پیاوێکی ڕەنگو ڕوو تەڕو برِو، لووتبەرزو بەفیزو دەعیەی لێبوو، یەکسەر بە سیمایدا زانیم هـەمان ئـەو پیاوەیـە کـە مـن کـارم پێیـەتی. زۆر بەگـەرمی پێشـوازی کـردم – وەکـو دەوڵەمەنـدێك پێشـوازی بێنەوایـەك بکـات. تەنانـەت بـەرەو منـیش گەڕایـەوە، بـەڵام لـە بـاقی جڤاتەکـە دوورنەکەوتەوە، نامەکەی لێوەرگرتمو گوتی: ***"ئۆ! ئەمە نامەی برایەکەمە! دەمێکە لە هەواڵی بیٚ ئاگام. هیوادارم ساغو سەلامەت بێت"***

ئەوسا، بێئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی مـن بکـات، ڕووی کـردە هاوڕێکـانیو بـەو نامەیـەی کـە بـە دەستیەوە بوو، گردێکی نیشاندانو لە درێژەی قسەکانیا گوتی:

***"ئەوێیە! ئەوێم داناوە بۆ ئەو تەلارە تازەیەی کە بە نیازم دروستی بکەم."***

بێئـەوەی زنجـیرەی گفتوگۆیەکـە بـبڕێ، مـۆری سـەر نامەکـەی لادا، چـونکە باسـی سـەروەت و سامان هاتبووە پێشێ، گوتی:

***"ئەگـەر کەسـێك بـەلای کەمـەوە خـاوەنی ملیونێـك نـەبێت، بمبـورن، لـەلات و لـەوێرێکی بـێ سەروپازیار هیچی تر نییە!"***

به تۆنێکی پڕ متمانەو باوەڕەوە هاوارم کرد:

*"ئاه! زۆر راستە!"*

وای نواند کە ئەم هاوارەی بە دڵ بووە، بزەیەکی بە روودا دام و گوتی:

***- دۆستی ئازیز، لێرە بمێنـەوە، بەڵکو دوایی دەرفەتێکم ببێ کە ڕای خۆمت لەمبارەیەوە پـێ بڵێم"***

مەبەستی لە وەڵامی راسپارنامەکەی من بوو کـە خستیە گیرفانییـەوە،و بـەرەو لای جماعەتەکـە گەڕایەوە. قۆڵی بە قۆڵی خانمێکی گەنجدا کرد،و ئـەوانی تـریش بـە چاولێکەری ئـەو، هەرکەسـەو بە پەلە گراوی دڵخوازی خۆیان هەڵبژاردو بە کۆمـەڵ بـەرەو گـردە پـڕ لـە گـوڵ و گوڵزارەکـە هـەوراز بوونەوە.

منیش بێئەوەی هیچ کەسێك سەخڵەت بکەم، هێدی هێدی بە دووی ئەواندا رۆییشتم، چونکە هیچ کەسێکیان دەربەستی من نەبوو. ئیدی کۆڕەکەیان زۆر گەرم بوو، گاڵتەو سوعبەتیان دەکرد، بە لەهجەی قورس باسی شتی سووك و بە لەهجەی سووك باسی شتی قورسیان دەکرد. بە کـەیفی دڵـی خۆیـان لـە هـەموو ئاشـێکیان دەکرد، بـە ئـارەزووی خۆیـان تیغـی زمانیـان خسـتبووە کـارو غەیبەتی دۆستان و ئاشنایانی خۆیان دەکرد. بەڵام من ئەوەنـدە غـەریب و نـامۆ بووم کە شتێکی ئەوتۆم لەم هەموو چەنەبازیە هەڵنەدەکڕاند. بە جـۆرێ لـە خـەیاڵی وەزع و حـاڵی خۆمـدا نقوم بـوو بووم کە نەمدەتوانی بیر لەم جۆرە لەگەزو مەتەڵانە بکەمەوە.

گەیشتینە گۆلگەشتەکە. فانی جـوان، شـابانۆی رۆژگـار، وڕکـی گـرت کـە گـوڵـەباخێك بکاتـەوە، دڕکێك بە دەستیدا چوو،و دڵۆپێ خوێنی ئەرخەوانی، عـەینی گوڵەباخەکـە لـە دەسـتە ناسـکەکەی تکا. ئەم ڕووداوە بووە مایـەی پەشـێوی و پەرێشـانی هـەموو جڤاتەکە. داوای پلاسـتەریان کـرد. پیاوێکی 40- 50 ساڵان، باریك و بنێس، لاوازو درێژو بێدەنگ کە لـە تەنیشـتی منـەوە دەڕۆیـی و من تا ئەو دەمە نەم دیتبوو، یەکسەر دەستی بە بەڕکی تەسکی جلکە ئەتڵەسە شینباوە کۆنەکەی خۆیـدا کـردو جانتایـەکی گچـکۆکەی لێـدەرهێنا، دەرکـی کـردەوەو پلاسـتەرە داواکراوەکـەی دەرهێنـاو، بـە رێـزو حورمەتـەوە پێشکەش بـە خـانمی کـرد. خـانم پلاسـتەرەکەی هـەڵگرت، بـەڵام دەرهـەق بەو پیـاوەی کـە ئـەم پلاسـتەرەی دایـە، نـە کردەوەیـەکی نوانـد کـە نیشـانەی بایەخدان و پێزانـی بـێ و، نـە قسـەیەکی کـرد کـە نیشـانەی سـوپاس و منـەتباری بـێ. زامەکـە پێچـراو، بـە گردەکەدا هەڵگەڕان، ئاسۆ لە سـەر ترۆپـکی گردەکـەوە، لـە سـەر هـەورازی هـەزار بـە هـەزاری سـەر سەوزی باخستانەکەوە تا پانایی ئۆقیانووسی بێ سنوور، هەر دەڕۆیی و تەواو نەدەبوو.

ئەلهـەقی ئەمـە دیمـەنێکی جـوان بـوو. خـاڵێکی رۆشـن لـە ئاسـۆوە، لـە نێـوان سـەوزایی تـۆخی شەپۆلەکان و رەنگی زومرووتی ئاسمانەوە سەرەتاتکێی دەکردو دەردەکەوت و هاواری کرد:

*"دووربين بێنن دووربين بێنن"*

پـێش ئـەوەی خزمـەتكارو دەسـتوپێوەندەكان، بـە پەلـە بـەدەنگ ئاغاكەيانـەوە بچـنو داواكـەی جێبەجێبكـەن، كـابرای شـينپۆش، زۆر خاكيانـە كڕنـۆشـێكی بـرد،و دوای ئـەم كڕنـۆشو ئيكلامـە، هەمـديس دەسـتی بـە بـەرگی خۆيـدا كـردو دووربينێكـی ماركـەی دۆلۆنـدی زۆر جـوانی دەرهێنـاو پێشكەش بە جەنابی (يون)ی كرد.

جـەنابی يـون، چـاوی بـە دووربينەكـەوە نـا، بـە جڤاتەكـەی گـوت كـە ئـەو خاڵـە ڕەخشـانەی لـە ئاسۆدا ديارە، كەشتيەكە كە دوێنێ شـەو كەوتووەتـە ڕێو بـەهۆی دژە بـاوە لـە مـەودای هەتـەری چاو ولە بەندەرەكە ڕاوەستاوە. دووربينەكە دەست بە دەست گەڕا، بـەڵام بـۆ دەسـتی خاوەنەكـەی نەگەڕايەوە. من بە سەرسامی لەم پيـاوە ڕامـام، تيـا مـابووم نەمـدەزانی چـۆن ئـەم ئامێـرە گەورەيـە لەو گيرفانە تەنگو تەسكەوە هاتە دەرێ. وێـڕای ئەمـەش واديـاربوو كـە هـيچ كەسـێك گـوێی لەمـە نەبێت،و وەكو چۆن دەربايسـتی مـن نـەبوون، بـەو ئاوايـە كەسـيش دەربايسـتی كـابرای شـينپۆش نەبوو.

نۆشابەی ساردو تـەزی ، دەگمەنترين ميوەی هەموو ناوچەكان، لە گرانبەهاترين قاپو ئامانـدا هێنـرا. جـەنابی (يـون) بـە شێوەيەكی خاكيانـەو سـەراپا لوتـفو مێريڤـانی، پـەزێرايیو خزمـەتی دەكرد. جارێكی تر رووی‌كردە منو گوتی:

*"بخۆ، لەمە سەفەرە دەرياييەتدا شتی وات نەخواردووە" .*

يەكسـەر ئيكلامـێكم بـۆ كێشـا، بـەڵام ئيكلامەكـەی مـنی نـەبينی: چـونكە لـەو كاتـەدا دەگـەڵ يەكێكی ديدا سوعبەتی دەكرد.

ئەگەر لە ترسی رتوبەتو شێداری ئەرزەكە نەبوايە، جماعەت ئامادەبوون بـە كـەماڵی ئـارەزوو، بۆ وەی لـەزەت لـە جـوانی ديمەنەكـە بـدينن، لـە داوێنـی گردەكـەدا، لـە عـاردی، لەسـەر چيمەنەكە دانيشن، يەكێكيان گوتی:

*"چەند خۆش بوو، گەر ئێستا سێ چوار تەختە فەرشی توركی لێرە ڕاخرا بوايە."*

هێشـتا بـە تـەواوەتی قسـەكەی لـە زار لـە زار دەرنەچـوو بـوو كـە كـابرای شـينپۆش دەسـتی بـە گيرفانيدا كرد، زۆر خاكيانەو بگرە خاكەساريانە، تەختە فەرشێكی گرانبـەهای زێڕچنـی دەرهێنـا كە دەستكاری توركی بوو. نۆكەرانیو خوڵامـان، وەك بڵێـی ئـەم كـارە كـارێكی زۆر ئاسـايی بـوو، فەرشـەكەيان لـە دەسـتی وەرگـرتو لـە شـوێنێكی ديـاريكراودا ڕايانخسـت. جماعـەت يەكسـەر لـە سەری دانيشتن. بەڵام من ديسان بە واقی وڕەوە روانيمە ئەو پياوەو ئەو گيرفانەو ئـەو فەرشـە كـە درێژييەكەی پتر لە بيست پێو پانيەكەی زياتر لە دە پێ دەبوو. بێئەوەی لە دەستی خۆمدا بـێو بزانم بير لە چی دەكەمەوە، چاوانم گڵۆفتن، بـە تايبـەتی كـە دەمبينـی هـيچ كەسـێك چ شـتێكی نـا ئاسايیو سەيری لەم كارەدا نەدەبينی.

زۆرم حـەز دەكـرد هەنـدێ زانيـاری لەمـەڕ ئـەم كابرايـە بـزانم، بـەڵام نەمـدەزانی روو لـە كـێو پرسيار لە كێ بكەم. راستت دەوێ ئەوەندەی سەرم لەو زاتانەی كە پێشـوازيان دەكـرد سـوڕدەما، نيـو ئەوەنـدە سـەرم لـەو زاتانـەی كـە پێشـوازی دەكـران سـور نـەدەما. ئاقيبـەت كـەمێك زاتم

وەبەرخۆناو لە گەنجێك كە – بەزۆری بە تەنیا بوو– پێدەچوو لە ڕووی عیزەت و ئیحتوبارەوە لەوانی تر کەمتر بێ، نزیك بوومەوەو بە ئەسپایی لێم پرسی کە ئەم پیاوە پڕخزمەت و خۆشخزمەتە شێنپۆشە کێیە.

*"ئەوەی کە دەڵێی داوەو لە دەرزی خەیات دەرچووە؟"*

*– بەڵێ، ئەوەی کە لە کەنارەوە وەستاوە.*

بەرسڤی دایەوە:

*– نایناسم.*

و بۆ ئەوەی درێژە بەو گفتوگۆیە لەگەڵ مندا نەدات، ئاوڕی لە کەسێکی دی دایەوەو سەری قسەی دامەزراندو باسی ئاسمان و ڕێسمانی لەگەڵدا کرد.

لەم کاتەدا هەتاو گەرمتر دەبوو و بەرە بەرە دەبووە مایەی سەغڵەتی خانمان. فانی خان و مان، بەبێ موبالاتیەوە، ئاوڕێکی لە کابرای شینپۆش دایەوەو ( ئەوەندەی من بزانم تا ئێستا هیچ کەسێك قسەی لەگەڵ دا نەکردبوو) و لێی پرسی کە ئاخۆ بە ڕێکەوت خێوەتێکی لە گیرفاندا نیە.

کابرای شینپۆش کە پێدەچوو خۆی بە شایستەی ئەم شانازییە نەزانێت، لە وەڵامی ئەودا دوو لۆ خۆی لە بەردەمیا نوشتانەوە. دەمو دەست دەستی بە گیرفانیا کردو، بینیم یەك لە دوای یەك پارچەو مێخی دارین و پەت و مێخ و خولاسە هەرچییەك بۆ جوانترین و شکۆدارترین خێوەت پێویست بێ، لە گیرفانی دەرهێنا. گەنجەکان لە هەڵدانی خێوەتەکەدا یارمەتیان دا، و هەموو پانتایی فەرشەکەی داپۆشی، و ئەمجارەش هیچ کەسێك کەمترین سەرسامی و تەعەجوبی نەنواند! بە هیچ جۆرێ شتەکەیان بەلاوە سەیرو نا ئاسایی نەبوو.

من خۆم لە خۆمدا، گیرۆدەی شپرزەیی و پەریشانیەکی توندو، بگرە ترسێکی ڕاستەقینەش بوو بووم. کاتێ کە دیتم ئەم کابرایە لەسەر داوایەکی دیکە، سێ ئەسپی سواری، لە گیرفانی دەرهێنا، مەگەر هەر خوا بزانێ چ حاڵێکم لێهات، بەڵێ، دەبینی؟ سێ دانە ئەسپی ڕەشی جوان، بە زین و تەدارەکی تەواوەوە! مەعز بۆ خوا، تۆزێ بیر بکەوە! بیهێنە بەرچاوی خۆت! سێ دانە ئەسپی زینکراو لە هەمان گیرفانەوە دەرپەڕین، کە جانتایەك و دووربینێك و فەرشێکی گوڵداری بیست پێ درێژو دە پێ پان و خێوەتێکی بە هەمان ڕەهەندان و بە هەموو کەرەستەیەکیەوە، لێ هاتبووە دەرێ! ئەگەر سوێندم بۆ نەخواردبای کە ئەم شتانەم بە چاوی خۆم دیت، بێگومان باوەڕت نەدەکرد.

چەند کابرای شینپۆش خۆی شپرزە دەکردو خاکەساری دەنواند، جماعەت ئەوەندە کەمتر بایەخیان دەدایێ. ڕوخساری زۆر بێڕەنگ و هەڵبزڕکاو بوو، هەر چیم دەکرد نەمدەتوانی چاوی لێبگوازمەوە، ترسێکی وەهای دەخستە دڵمەوە کە مەحاڵ بوو لەوەی پتر لە حوزوری ئەودا هەڵبکەم.

خەریك بووم لەم کۆڕو مەجلیسە هەڵبێم، و ئەم کارە، بە حوکمی ئەوەی دەورو ڕۆڵێکی ناچیزم تیایدا هەبوو"1"*، ئاسان دەهاتە بەرچاو. دەمویست خۆم بگەیەنمەوە شارو سبەینێ

دووباره بچمەوە بۆ دیداری جەنابی یون،و ئەگەر بوێرم هەندێ شتی لەمەڕ ئەو کابرا شینپۆشە سەیرو عەجیبە لێبپرسم. داخەکەم هەلم بۆ هەڵنەکەوت کە بە دزییەوە هەڵێمو بڕۆم!.

لە گوڵگەشتو باخەکە تێپەڕی بوومو لە بناری گردەکەدا، لە نێو چیمەنەکەدا بووم کە لە ترسی ئەوەی نەبا لە ناغافڵدا، لە دەرێی شەقامەکاندا، لە نێو چیمەنو سەوزەزارەکەدا، گرفتار ببم، پەریشانو پەشێو چاوێکم بە دەوری خۆمدا گێڕا.کە بینیم کابرای شینپۆش لە دواوە بەرەولای من دێت، مەگەر هەر خوا بزانێ چ ترسو خوفێکم لێنیشت! .

لەو کاتەدا کلاوەکەی لەسەر داگرتو ئیکلامێکی بۆ کردم ئەمما ئیکلام. لە عەمراتما کەس ئیکلامی وەهای بۆ نەکرد بووم. بە ئاشکرا دەیویست لێم نزیك ببێتەوەو قسەم دەگەڵدا بکا،و من نەمدەتوانی خۆمی لێبدزمەوە، چونکە ئەو کارە دەبوو بە بێ ئەدەبی. ئیدی منیش بە ڕێزەوە کلاوەکەم لەسەر داگرتو ئیکلامێکم بۆ ئەو کردو بەسەری کۆتەوە لەبەر هەتاوەکەدا مامەوە، دەتگوت لەوێندەر چەقیوم. وەکو چۆن باڵندەیەك مارێك ئەفسوونی کردبێتو لە جێی خۆی بەنج بووبێ، بەو ئاوایە، بە دڵی پڕ لە ترسو خۆفەوە زەق زەق چاوم تێبڕی بوو. ئەویش زۆر شپرزەو پەشێو دیار بوو، سەری هەڵنەدەبڕیو بە هەمان دەقەوە ئیکلامی دەکردو کڕنۆشی دەهێنا. ئەنجام هاتە پێشەوەو بە دەنگێکی نزمو لەرزۆکەوە،و بە شێوازێکی کەم دابێژێك سواڵکەرانە لەگەڵمدا کەوتە قسان:

"بمبورە ئەگەر بێ پێشەکیو بێ هیچ ناسیاوییەك زاتی ئەوەم بە خۆدا بێ کە لە جەنابت نزیك ببمەوە، بەندە تکایەکم لە خزمەتی موبارەکی مسێودا (جەنابت) هەیە. ڕێگەم پێ بفەرموون کە...

بە هەمان ئەو پەشێویو پەرێشانیەوە کە بەسەرما زاڵ بوو، هاوارم کرد:

– ***مەعز بۆ ڕەزای خوا، ئاخر من چ کارێکم بۆ کابرایەکی.... لە دەست دێ کە...؟".***

هەردووکمان خامۆش بووین،و پێموایە سورو هەڵگەڕاین"2"*.

دوای کەمۆکەیەك بێدەنگی، لەسەر قسەکەی رۆیی:

***"لەم ماوەیەدا کە بە خزمەتی جەنابت مشەڕەف بوومو فەیزی دەمو دووی ئێوەم پێبڕا، چەندین جار (مسیۆ، ڕێم بدە عەرزی جەنابی با سەعادەتت بکەم) بە ئیعجابی لە رادەبەدەرەوە کەوتمە تەمەشای ئەو سێبەرە جوانەی کە جەنابتان بە تەوازوعی خانەدانانەوەو بە بێ موبالاتیەوە، لەبەر هەتاوەکەدا فڕێی دەدەیە سەر عاردی، بەڵێ، هەمان ئەو سێبەرە یەجگار جوانەی کە هەنووکە لە ژێر پێتاندا کەوتووە. پێشنیازێکم هەیە کە هەڵبەتە پێشنیازێکی بێ پەروایانەیە، بمبوورە: "ئەم سێبەرە بە من نافرۆشێت؟"***

زاری لێك نا، وام خەیاڵدەکرد کە چەقەنەی ئاشێك لە کەللەمدا دەگەڕێ. تیا مابوومو نەمدەزانی چۆن وەڵامی پێشنیازە سەیرو سەمەرەکەی ئەم کابرایە، کە مرخی لە کڕینی سێبەرەکەم خۆشکردبوو، بدەمەوە؟ لە دڵی خۆدا گوتم: ***"دیارە شێتە"***،و ئەوسا بە شێنەیی وەڵامم دایەوە: ***"ئۆهـ! ئۆهـ! دۆستی ئازیز، ئەدی ئەو سێبەرەی کە خۆت هەتە، بەس نیە؟ من ئەمجۆرە سەوداو معامەلەیە زۆر بە غەریب دەزانم."***

قسەکەی بڕیم:

***" من لە نێو ئەم گیرفانەمدا هەندێ شتم هەیە کە لەوەیە بەلای جەنابتەوە بایەخدار بن. جا من پێموایە، گرانترین نرخ لە بری ئەم سێبەرە هەرە بەنرخەی مسێودا، یەجگار کەمە."***

دووبارە ئارەقەیەکی سارد نیشتە سەر ئازام، چونکە گیرفانەکەیم وەبیرهاتەوەو هەرچیم کردو کۆشا نەمزانی چۆن و بۆ پێم گوت: ***"دۆستی ئازیز"***. لەسەر قسەکانم رۆییشتم و هەموو توانایەکی خۆم وەگەڕخست تا بە زەبری ئەدەب قەرەبووی ئەو هەڵەیە بکەمەوە:

***" سەروەری من، نۆکەری بچووکتان عەفو بفەرموون. هەڵبەتە لە مەبەستتان تێناگەم. چی! سێبەری من...."***

قسەکەی بڕیم:

***" تاقە شتێك کە لەمسێوم گەرەکە ئەمەیە کە ئیجازە بفەرموون تا ئەم سێبەرە گرانبەهایە لێرە، لەسەر ئەم ئەرزە هەڵبگرمەوەو بیخەمە گیرفانمەوە. جا سەبارەت بە جۆری جێبەجێکردنی ئەو کارە عەرزی جەنابی با سەعادەتتان دەکەم کە من بە خۆم ئەم کارە دەکەم. جا من لە جیاتی ئەم سێبەرە، بە مەمنونیەوە، ئەم هەقە بە مسێو دەدەم کە سەر پشك بێ و لە نێو هەموو شتە گرانبەهاکانی نێو گیرفانمدا، یەکێکیان بۆ خۆی هەڵبژێرێ: گیا جادوویی گلۆکۆس، میهرگیا، دوو پولی جولەکەی سەرگەردان، سکەی دز، سفرەی خولام ڕۆڵان، جنۆکەی ماڵی ، بە هەر نرخێ کە بەدڵتان بێ"3"* بەڵام نا.... ئەم شتانە بە کەڵکی ئێوە نایەت. مەسڵەحەت لە وەدایە کە کڵاوە جادووییەکەی فۆرتوناتوس ، کە بە شێوەی کڵاوی تازە دروستکراوە، یان هەنبانەیەکی وەکو هەنبانەکەی ئەوتان بدەمێ...***

هاوارم کرد:

***- هەنبانەکەی فۆرتوناتوس!"***

سەرباری ترسە لە رادەبەدەرەکەم، ئەم وشەیە بە جارێ ئەقڵ و هۆشی بردبووم، سەرەگێژکەم پێکەوت، وام خەیاڵ دەکرد کە سکە زێڕەکان بە بەرچاومەوە گرشەگرش دەدرەوشێنەوە.

***- مسێو، فەرموو دیقەتی ئەم هەنبانەیە بدەو تاقی بکەرەوە.***

بەدەم ئەم قسانەوە دەستی بردو هەنبانەیەکی چەرمی خۆشەکراوی زۆر گەورەی کە مەحکەم دورا بوو،و دوو پەتی درێژی پێوە بوو، لە گیرفانی دەرهێنا. هەنبانەکەی خستە بەردەستم،و منیش دەستم پێدا کرد. دە سکەی زێڕ، پاشان دە سکەی دی، ئەوسا دە سکەی دیکەو هەروەها دە سکەی دیکەشم لێدەرهێنا:

***"قەبوڵمە! قاییلم، ڕێك کەوتین! لە بری ئەم هەنبانەیە سێبەرەکەمت دەدەمێ."***

دەستی گرتم و لە بەردەممدا چۆکی دادا: سەیرم کرد لە سێبەرەکەم نەوی، لە سەرەوە تا خوارێ، بە کاوەخۆ، نەرم نەرم و بە زەبەردەستییەکی سەیرەوە، لەسەر چیمەنەکە هەڵیگرت، لوولی داو قەدی کردو، هەنگێ لە گیرفانی نا.

هەستایەوە، دیسان ئیکلامێکی بۆ کردم و بەرەو باخەکە گەڕایەوە. وام هاتە بەرگوێ کە بە ئەسپایی پێدەکەنێ. بەڵام من پەتەکانی هەمبانەکەم توند گرتبوو. عاردەکەی دەوروبەرم نقومی

تیشکی خۆرەکە بوو بوو و دەبریقایەوە و، هێشتا پەرتحەواس و پەریشان بووم‌و وەخۆ نەهاتبوومەوە.

***پەراوێز:***

*1- هەندێ کەس ویستوویانە جۆرە لێکچوونێك ە نێوان ئەم کاراکترە چیرۆکڤانییەو سیرس دۆڤرینای جواندا بدۆزیەوە کە بەر لەوەی شوویەکی سوودمەندتر بە پێویکی تر بکات، میانەیەکی خۆشی دەگەڵ شامیسۆدا هەبوو، وجۆرە ئومێدێکی ئاشقانەی لە دڵی شامیسۆدا دروست کردبوو.*

*2- ئەمە دان پێدانانێکی راستەوخۆی شامیسۆیە کە زۆربەی کات وەکو بێگانەیەك تەمەشاکراوەو نەیتوانیوە دەگەڵ هیچ ژینگەیەکدا بسازێت و هەڵبکات.*

*3- ئەمە ئەوە وەبیر دەخاتەوە کە ئەم شەیتانە ،بەتایبەتی لە سەدەکانی ناڤیندا چ سیمایەکی خۆشباوەرانەو کۆمیدی دراوەتێ. بەڵام وەك ئاگادارین شامیسۆ زۆر دڵبەندو ئاشقی خوێندنەوەی فابیلۆی (چیرۆکی گیانلەبەران) فەرەنسی بووە. فابیلۆ، وەك دەڵێن چیرۆکێکی کورتی شیعرییە کە هەندێجار خۆش وکۆمیدییە و هەنێجاریش پڕ پەند و ئامۆژگارییە..فابیلۆ ژانرێکی ئەدەبییە کە لە سەدەی سیانزەو چواردەدا باو بووە..*

**- گیای گلۆکۆس: کە (ئارنیم) پێشتر لە چیرۆکەکەی خۆیدا (ئیزابیلی میسر) نێوی بردووە، توانای ئەوەی هەیە زمانەی هەموو قفڵێك بکاتەوەو هەموو دەرگایەك بکاتەوە. جا بۆ وەدەستهێنانی ئەم گیایە، دارکونکەرەیەکی ڕەش دەگرن کە پێشوەختە دەرکەی هێلانەکەیان بەستووە. چونکە دارکونکەرە ئەم گیایە دەناسێت، بۆ کردنەوەی دەرکی هێلانەکەی دەکەوێتە تاقیب‌و دۆزینەوەی ئەو گیایە.*

**- سکەی دز: سکەیەکە کە هەر جارێك بۆ لای خاوەنەکەی خۆی دەگەڕێتەوە، تەماسی لەگەڵ چەند سکەی زێڕدا کردبێ، هەمووی لەگەڵ خۆیدا دێنێ.*

**- سفرەی خولامی رۆلان: سفرەیەکە بەزەبری جادوو وئەفسوون، پڕ دەبێت لە هەر جۆرە خواردنێك کە دڵ ئیشتیای بکات.*

**- فۆرتوناتوس: هەنبانەیەکی هەبوو کە لە بن نەدەهات، چەند زێڕت لێ دەرهێنابا هەر بە تاڵ نەدەبوو.و کڵاوێکی جادوویی هەبوو کە لە سایەیدا بۆ هەر کوێیەکی ویستبا دەڕۆیی. شا مسیۆ ئەم بابەتەی لە ساڵی 1806دا لە درامایەکی شیعرییدا کە تەواوی نەکرد، بەرجەستە کردووە: زۆری حەز لە ئەفسانانی میللی بوو،و لەو ماوەیەدا کە لە پاریس ئاکنجی بوو بۆ خوێندنەوەی ئەم ئەفسانانە هاتوچۆی کتێبخانەی ئیمپراتۆریەتی دەکرد.*

**- میهرگیا: وەکو مانای حەرفی بە مانای (مێردەکی دارین) دێت. هەروەها میهرگیا ناوی چیرۆکێکی فوکەیە کە لە ساڵی 1810دا لە گۆڤاری پانتیۆن دا بڵاوبووەتە وە. "بە گوێرەی*

لێکدانەوەی کوروا Goeuroy، لە سەدەکانی ناڤیندا وا تەسەور دەکرا کە بە شێوە غەریبەکانی رەگ‌و ریشەکانی خۆی، وێنەو بیچم‌و شێوەی سەراپا وەهەم‌و خەیاڵی غەریب‌و پێکەنیناوی مرۆڤ وەبیر دێنێتەوە، لە ژێر قەنارەو سێدارەدا، لە نوتفەی ئیعدام کراوانەوە چێدەبێت‌و لە دایک دەبێت. رۆڵی ئەم گیایە لە جادووگەری‌و ئامادەکردنی شەیتاندا زۆر بووە.

*- رۆح یان جنۆکەی ماڵی، کە برایانی گریم لە ئەفسانانی ئاڵمانی دا دەڵێن: پەیوەندی نزیکی بە میهرگیاوە هەیە. "واباوە کە لە شووشەیەکدا دادەنرێ‌و سەرەکەی توند دەنرێتەوە. لە جاڵجاڵۆکەی تەواو دەچێت نە لە دووپشك، بەڵام بە بەردەوامی دەجوڵێت. هەر کەسێك بیکرێت، بەردەوام لە گیرفانی خۆیدا دەی بینێتەوەو شووشەکە لە هەر شوێنێ دابنێ، بەردەوام‌و خۆ بە خۆ دەگەرێتەوە ناو گیرفانی. دەبێتە مایەی بەختەوەرییەکی فرە، توانای کەشفکردنی گەنجینانی نهێنی‌و شاراوەی دەداتێ، دەبێتە مایەی ئەوە کە دۆستەکانی خۆشیان بوێ،و دژمنەکانی لێی بترسن‌و سڵی لێبکەنەوە. هێزو توانای پۆلایین بە خاوەنەکەی دەبەخشێت، بە جۆرێ کە خاوەنەکەی هەمیشە لە شەڕدا سەردەکەوێ‌و هەرگیز ئەسیری دژمن نابێت. پێویست ناکات وەکو میهرگیا سەرپەرشتی‌و خزمەت بکرێ، بشۆردرێ‌و یان جلی لەبەر بکرێت. بەڵام هەر کەسێك تا رۆژی مەرگی خاوەنی بێ، دەبێ لەگەڵ ئەودا بچێتە دۆزەخ و، لەبەر ئەمەیە کە هەمیشە لە بیری فرۆشتنیدایە. هەڵبەتە بە هەرزانترین نرخ نەبێ نافرۆشرێ، جا بۆ ئەوەی لە دوا ئەنجامدا خاوەنێکی هەبێ بە کەمترین نرخ دەفرۆشرێت.

ئەنجام وەخۆ هاتمەوەو بە هەشتاو کەوتمە خولیای بەجێهێشتنی ئەو شوێنەی کە خواخوم بوو ئیدی هیچ کارێکم لەوێ نەبێت. یەکەمجار گیرفانەکانم لە دراوو سکەی زێڕ پڕکرد. پاشان هەنبانەکەم لە مل کردو لە باخەڵمدا شاردمەوەو بە دزییەوە لە باغستانەکە وەدەرکەوتمو خۆم گەیاندە شارێیەكو بەرەو شار وەڕێکەوتم.

نقومی بیرو خەیالاتی خۆم بووم، نزیکی دەروازەکە بوو بوومەوە کە لە ناکاو لە پشتەوە گوێم لە دەنگێك بوو:

***"لاوۆ! ئەهای! لاوکۆ! گوێ بگرە!"***

ئاوڕم دایەوە. پیرەژنێك بانگی دەکردم:

***"وتم با مسێو ئاگادار بێ، سێبەرەکەی ون کردووە!"***

***– زۆر سوپاس، مەمنونم، دایە گیان!" .***

لەبری ئەم چاکەیەی سکەیەکی زێڕم بۆ هەڵداو بە ژێر درەختەکاندا ڕۆییشتم.

لەبەر دەروازەی شاردا هەمان قسەو ئاگاداریم گوێ لێبووەوە. پاسەوانی دەروازەکە گوتی: **"مسێو، سێبەرەکەی لە کوێ داناوە؟".**

دەتوانم بڵێم کە لە هەمان کاتدا سێ چوار ژنێك تێکڕا گوتیان:

***"وی یا عیسا مریەم! نەگبەتە سێبەری نیە!"***

ئەم قسانە بەرە بەرە بێتاقەتیان کردم، و زۆر بە دیقەت خۆم لە ڕێکردنی بەر هەتاو دوور دەگرت. بەلام ئەم کارە لە هەموو شوێنێکدا نەدەلوا، بۆ نموونە ئەم کارە، لە شەقامی سەرەکی شاردا، کە بۆ نەگبەتی ناچار بووم، ڕێك لەو کاتەدا پێیدا تێپەڕم کە منداڵان لە قوتابخانە بەردەبوون، نەدەلوا. منداڵێکی قەمووری مەلعوون کە ئێستاش لەبەر چاومە، یەکسەر هەستیکرد کە من سێبەرم نیە"1" بە قاوەقاو لەبەردەم ئاپۆرای قوتابیان و خوێنکارانی ئەو دەڤەرەدا پۆتی شکاندم، هەر ڕیسوای کردم.و قوتابیەکانیش یەکسەر کەوتنە بەرد باران‌و سیاناو وقوڕاو بارانکردنم. هاواریان دەکرد: ***"دروسکاران، چاکەکاران، عادەتیان وایە کە لە کاتی ڕێکردن بە بەر هەتاودا ، سێبەرەکانیان لەگەڵ خۆدا بەرن." .***

بۆ ئەوەی لە چنگیان دەرباز بم، چنگ چنگ سکەی زێڕم بۆ هەڵدەدان و، خۆم بە گالیسکەیەکدا کرد کە خەڵکانی دڵسۆز فریایان خستم.

هەرکە خۆم بە تەنیا لە نێو گالیسکەکەدا بینییەوە، بە کوڵ گریام. هەر زوو دڵم خەبەری دا ئەگەر زێڕ لەم دنیایەدا چەند لە شایستەیی‌و لیاقەت‌و کەسایەتی‌و فەزڵ‌و هونەر زیاترو گرینگتربێ، ئەوا سێبەر لە خودی زێڕیش زیاترو بالاترە.

مـن کـە جـاران سـەروەت‌و سـامانم کردبـوو بـە قوربـانی ویـژدانم. هەنووکـە سـێبەرەکەمم بـە سەروەت‌و سامان فرۆشتبوو. ئاخۆ لەمە بەدواوە، لـەم دنیایـەدا، لەسـەر رووی زەمینـدا دەبـیٚ چ چارەنووسێکم ببیٚ ؟

هێشـتا لـە هـەڕەتی پەریشـانی‌و پەشـێوی خۆمـدا بووم کـە گالیسـکەکە لـە بـەردەم ئوتێلەکـەی پێشوومدا ڕایگرت. کە بیرم لە ژووره شوومەکەی ژێـر شـێروانیەکە کـردەوە، موچـوڕەکەیەکم پێدا هات‌و بەدەنم ڕاجفری. داوام کـرد باروبنـە ناچیزەکەم لـەو ژووره بێننـە خـوارەوە. باروبنەکـەم بـە لووت‌و پووتێکەوە وەرگرت. چەند دراوێکی زێڕم داناو بە گالیسکەچیەکەم گـوت کـە بـۆ باشـترین ئوتێلم ببـات. ئـەم ئوتێلـە ڕوو لـە بـاکوور بـوو، نسـیٚ بـوو، ترسـی هـەتاوم نـەبوو. بڕێـك زێـڕم بـە کـابرای گالیسکەچـی داو داوام کـرد کـە جـوانترین شـووقەم نیشـان بـدەن کـە بڕوانێتـە سـەر شەقامەکە،و لەویٚ، خێرا دەرگاکەم لەسەر خۆم داخست.

بە مەزندەی تـۆ ئەوسا چیم کرد؟ ئەی شامسێوی ئازیزم، شـەرم دەکـەم تەنانـەت بـۆ تۆیشـی بگێڕمـەوە. هەنبانـە شـوومەکەم لـە باخـەڵم دەرهێنـا. بـە تونـدی و تووڕەییـەکی شـێتانەوە، زێـڕو زێڕ،وزێڕم لێی دەرهێنا. ئەم زێڕەم بەسەر عاردەکەدا بڵاودەکردەوە، بەپێوە دەچـوومە سـەری، بە سـەریا دەڕۆیشـتم، پێشـێلم دەکـرد، بـەزرِوهورِ بـە ژوورەکـەدا غلـم دەکـردەوە، لـە کاتێکـا دڵـەی نەگبەتم لە دەروشانەوەو زرەی ئەو زێڕە تێر دەکرد، بێوچان لەسـەر یـەك کەڵـەکم دەکرد، بەسـەر یەکدا هەڵمەدەدایـەوەو دەمکـرد بـە خـەرمان، تـا سـەرەنجام شـەکەت‌و مانـدوو لەسـەر ئـەم جێگـا گرانبەهایــە ڕاکشــام، بەوپــەڕی لــەزەت‌و خۆشــیەوە هــەڵگێرو داگێــرم دەکــرد، سەرمەســت‌و سەرخۆش‌و بێخەبەر لە خۆ، خۆم تیایدا دەگەوزاند. شەوو ڕۆژێکم بـەو ئاوایـە ڕابـوارد. دەرگاکـەم نـەکردەوە شـەویٚ خـۆم لەسـەر خـەرمانی زێـڕ بینیـەوە، سـەرەنجام لەسـەر خـەرمانی زێـڕ خـەو بردمیەوە.

خـەوم بـە تـۆوە بینی. وام هەسـتدەکرد. کـە لەبـەر دەرگـا شووشـەییەکەی ژووره چـکۆلەکەی تۆدام‌و تۆ دەبینم کە لە پشت مێزی نووسینەکەتەوە، لە نێوان ئێسکەپەیکەرێك‌و گورزەیەك گیای وشکەوە بوودا دانیشتوویت. کتێبـەکانی هالـەر"2"و هومبولـت"3"و لینـە"4"ت لەبـەر دەمـدان،و بەرگێك لە بەرهەمەکانی گوتەو ئەڵقەی جادوو"5"ش لەسەر نیمتەختەکەت کرابووەوە. ماوەیەکی زۆر لە تۆ،و پاشان لە هەموو شتەکانی دەورووبەرت ڕامام‌و ورد بوومـەوە، بـەڵام تـۆ لـە جێـی خـۆت نەدەجوڵای، هەناسەت نەدەدا، مردبوویت!

بێدار بوومەوە. بە ئەقڵم هێشتا بەیانیەکی زۆر زوو بوو. سەعاتەکەم لە کار کەوتبوو. دەتگـوت ئـازای گیـانم تێکشـاوەو شـەکەت‌و مانـدوو بـووم، خـەریك بـوو لـە برسـاناو لـە تینوانـا دەمـرم. لـە دوێـنیٚ بەیانیـەوە هیچـم نـەخواردبوو. بـە تـوڕەیی‌و بێـزاری، ئـەو زێـڕەم کـە یـەك دوو سـەعاتێك لەوەپێش، شێت ئاسا دڵم پیٚ خۆش بوو،و مەستی مەستی کردبووم، توڕدایە لاوە. هەنووکـە لێم بوو بوو بە بارو مایەی بێزاری‌و توڕەیی‌و نەمدەزانی چی لێبکەم. نەدەبوو بەو شێوەیە لەو عەردە بکەویٚ. کەوتمە تاقیکردنەوەی ئەوەی کە بزانم هەنبانەکە هەڵیدەلوشێتەوە یان نا... بـەڵام بێهودە بـوو. هەنبانەکـە نەدەچـووە ژێـر ئـەم بـارە! هـیچ یـەکێك لـە پەنجـەرەکانم بـە رووی دەریـادا

نەدەكرايەوە. ناچار بووم بە هەزار زەحمەت و دەردانی ئارەقەی شین و مۆرەوە بیبەمە ئەو کەنتۆرە گەورەیەی کە لە وچخانەکەدا بوو. جگە لە چەند مستێك هیچم لەسەر عەردەکە نەهێشتەوە. کە لەم کارە بوومەوە، شەکەت و ماندوو، خۆم دا بەسەر کورسیەکی دەسکداراو چاوەڕوانم کرد تا بەرە بەرە گارسۆن و پێشخزمەتانی میوانخانەکە بکەونە جم و جۆڵ. ئەوسا داوای خواردنم کردو ناردم بە شوێن خاوەن ئوتێلەکەدا. دەربارەی کاروبارو نەزم و نیزامی ئاینەدەی ماڵەکەم قسەم دەگەڵی کرد. بینەدڵ ناوێکی، وەکو پێشکارو پێشخزمەتی شەخسی پێناساندم. سەروسیمای سادەو هۆشمەندانەیم زۆر چووە دڵەوە. ئیدی لەوە بە دواوە، بە دڵسۆزی و وەفاداری خۆی بوو بە شەریك و خەمرەوێنی ڕەنج و مەینەتیەکانی ژیانم، لە تەحەمولکردنی ئەو چارەنووسە پڕ ئازارو خەمناکەدا کە هەمبوو یارمەتی دام. سەرانسەری ڕۆژەکەم دەگەڵ نۆکەرانی خێومردەو پینەدۆزو کەوشدرو و خەیاتان و فرۆشیاراندا بەسەر برد. جێگیر بووم، نەمازە شتی گرانبەهاو جەواهێری زۆرم کڕی، بۆیە ئەمەم کرد تا بەشێکی کەم لە سکە زێڕەکانم لە کۆڵ خۆ بکەمەوە، بەلاّم کۆما زێڕەکە هەر لە شوێنی خۆی بوو، لەوە نەدەچوو کە هیچ کەمی کردبێت.

لەگەڵ هەموو ئەم شتانەدا، خراپترین وەزع و حاڵم هەبوو، لە خەمناکترین دوو دڵیدا دەژیام. نەدەوێرام پێ بنەمە ئەو دیوی دەرگاکە، شەوانە، بەر لەوەی لە ژوورە تاریکەکەم وەدەرکەوم، فەرمانم دەدا کە چل دانە مۆم لە ساڵۆنەکەمدا داگیرسێنن. بە ترس و لەرزەوە، بەرخوردی ترسناکی خۆم دەگەڵ قوتابیەکاندا، وەیاد دێنایەوە. زۆرم لە خۆ کردو لێبڕام کە جارێکی دیکەش خەڵکەکەو ڕای خەڵکەکە تاقی بکەمەوە. ئەوسا هەتاو بوو. شەوێ، درەنگانێ،خۆم لە پاڵتۆیەکی دەڵبەوە پێچا، شەپقەکەم تا سەر چاوانم هێنایە خوارێ و بە ترس و لەرزەوە وەکو تاوانبارێك بە خشکەیی لە ماڵ وەدەرکەوتم. لە شوێنێکی دوورە دەستا بوو کە سەرەنجام لەبەر سێبەری ئەو خانووانەی کە تا ئەو ساتە بوو بوون بە پەناگام و حەشاریان دابووم، هاتمە دەرێ،و بەو نیازەی کە لە زمانی ڕێبوارانەوە باسی چارەنووسم بژنەوم، هاتمە بەر هەیڤە شەوەکە.

برادەری ئازیز، مەگەر هەر خۆم بزانم چیم بەسەر هات، بمبورە لە شرۆڤەو گێڕانەوەی ئەو دەردەسەرییەی بەسەر مندا هات.

ژنان، بە زۆری لە ناخی دڵەوە بەزەییان پێدا دەهاتمەوەو بە ئاشکرا ئەم سۆزو بەزەییەیان دەردەبڕی،و ژاراوی ئەو نەشتەرەی کە ئەم بەزەییە لە گیانی دەدەم هیچی کەمتر نەبوو لە نەشتەری کوشندەی تەڵفیزی لاوان و تانەو تەشەری خۆ پەسندانەی پیاوان، بە تایبەتی تەشەری ئەو کەسانەی کە خەڵکانێکی بە هەیکەل و بەقەدو بالاّو تۆکمە نەبوون،و سێبەرێکی پانۆ پۆڕیان لە خۆ بەر نە دەدایەوە. کیژێکی جوان و دڵڕفێن کە دەگەڵ دایك و باوکیدا بوو، لەو دەمەدا کە باوك و دایکی بە جددی و بە پارێزەوە دەیانڕوانیە پێی خۆیان، بە ڕێکەوت چاوی پرشنگداری بەرەو من وەرگێڕا،و کە بینی من سێبەرم نیە، لە ترسا کەوتە لەرزین، ڕووە جوانەکەی بە سەر پۆشەکەی داپۆشی و، سەری داخست و بەکڕی دوورکەوتەوە.

لەوەی پتر تەحەمولم نەکرد. فرمێسك بە خوڕ لە چاوانم هاتە خوارێ، ڕەنجاوو دڵشکاو، بەلارەوە لارەوە خۆم بە تاریکییەکەدا کرد. بۆ وەی لاقم لە دووم بێت، خۆم بە دیواری ماڵەکانەوە گرتو بە خاوەخاو و بە درەنگەوە، ئەوجا توانیم بۆ ماڵەکەم بگەڕێمەوە.

بە درێژایی ئەو شەوە نەنووستم. بەیانی هەموو هەوڵو تەقەلایەکم بوو بەوەی کە کەسێك بۆ سۆراخی کابرای شینپۆش بنێرم. بەڵکو ئێ ئەمە خوایە بیدۆزمەوەو ، ئەگەر ئەویش وەکو من، لەم سەودا گەوجانەیە پەشیمان بوایە، دوو شەشم بوو! (بیندل)م گازکرد. بە دەماخو زیتەڵو هۆشمەند دیار بوو. سیماو بیچم و هەیئەتی ئەو پیاوەم بە دروستی بۆ نووسی کە چارەنووسی من، کە گەنجێکی لە دەستا بوو، کە ژیانم بەبێ ئەو گەنجە یەکپارچە دەردو عەزاب بوو. نیشانی کاتو شوێنی دیداری خۆمم لەگەڵیا، بۆ هەڵدا. وەسفێکی هەموو ئەو کەسانەم بۆ کرد کە لەو مەجلیسو کۆڕەدا ئامادە بوون، بۆ زانیاری زیاتر، لە دوای قسەکانمەوە پێمگوت کە بە دیقەت چاو بۆ دووربینێکی دۆلاندو وتەختە فەرشێکی زێڕچنی توركیو خێوەتێکی جوانو ڕازاوەو بۆ ئەسپانی ڕەش بگێڕێت، ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە چیرۆكو حیکایەتی ئەو کابرا ڕازدارەوە هەبوو کە گوایە مایەی بایەخو سەرنجی کەس نەبوو،و دەرکەوتن و پەیدا بوونی ئەو، ئارامیو بەختەوەری منی بە جارێ نەهێشت.

دوای ئەوەی ئەو زانیاریانەم دایە، چوومو ئەوەندەی کە پێم هەڵبگیرێت، زێڕم هەڵگرت، بەردی گرانبەها و جەواهێراتی زۆر بە نرختریشم خستە سەرێو گوتم:

***"بیندل ئەم شتانە زۆر ڕێگایان هەموار دەکەنو زۆر شتی نیمچە مەحاڵ ئاسان دەکەن. جا لەم ڕووەوە وەك من ڕەزیل مەبە، نەکەی لە من ڕەزیلتر بیت، دەیسا برۆ،و ئاغای خۆت، بە هەواڵێکی خۆش، کە هەموو هیواو ئومێدێکی بەو هەواڵەوە بەندە، شادو دڵخۆش بکە!"***

درەنگانێك بە خەمباری گەڕایەوە. هیچ یەکێك لە دەستو پێوەندو خولامانی جەنابی یون، هیچ یەکێك لە میوانەکانی (کە بیندل قسەی دەگەڵ گشتیاندا کردبوو) کەمترین ئاگاداریان لەمەڕ کابرای شینپۆش نەبوو بوو. دووربینێکی نوێ لەوێندەر بوو،و هیچکەسێك نەیدەزانی لە کوێوە هاتووە، فەرشو خێوەتەکە هێشتا هەر بە گردەکەوە بوو، فەڕاشو پێشخزمەتان ستایشی سەروەتو دەوڵەتی ئاغای خۆیان دەکرد، هیچکەسێك نەیدەتوانی بڵێ ئەم شتە جوانو تازانەی چۆن بۆ خۆی فەراهەم کردووە. خۆیشی دڵی بەم شتانە خۆش بوو و لەزەتی لێدەبینی، لێ دەربەستی ئەوە نەبوو کە بزانێ لە کوێ بە دەستی هێناون. ئەو لاوانەی کە سواری ئەسپەکان بوو بوون هێشتا ئەم ئەسپانەیان لە تەویلەکانی خۆدا ڕاگرتبوو، ستایشی کەرەمو سەخاوەتی جەنابی (یون)یان دەکرد کە بە دیاری ئەو ئەسپانەی دابوونێ. ئەمە تێکڕای نێوەڕۆکی ڕاپۆرو هەواڵە دوورو درێژەکەی بیندل بوو، کە پیاوەتیو دووربینی ئەو، وێڕای ناکامی هەوڵەکانی، بە هەق بووە مایەی ڕەزامەندیو ستایشی من. ئیدی بە خەمبارییەکەوە ئاماژەم کردێ کە بە تەنیام جێ بێڵێ.

لەسەر قسەکانی ڕۆیی و گوتی:

*"من هەواڵی ئەو شتەم هێنایە خزمەتی جەنابی موبارەکتان کە زانینی لە زانینی هەر بابەتێکی دیکە بۆ مسێو پێویست تر بوو.جا ئیستا پەیامێکی دی ماوە کە پێویستە عەرزی خزمەتی با سەعادەتتانی بکەم، ئەویش گەیاندنی پەیامێکە کە ئەمڕۆکە بەیانی کاتێ لە ماڵ ھاتمە دەرێ تا بە دووی کارێکدا بڕۆم‌و کارەکەشم نەبوو، لەبەر دەرگادا تووشی کەسێك بووم کە ئەم پەیامەی بە ملدا دام.و ئەمەش دەقی ئەو پەیامەیە کە ئەو پیاوە پێی گوتم: "بە جەنابی پیتر شلمیل بڵێن کە ئیتر من لێرە نابینێ، چونکە گەرەکمە تا بایەکەی خۆش‌و هەموارە لە دەریا بپەڕمەوەو بگەمە بەندەر، بەڵام لە ئەمڕۆوە تا ساڵێکی دی شانازی بەوەوە دەکەم کە سەردانی بکەم‌و سەودایەکی دیکەی دەگەڵدا بکەم کە لەگینە ئەو کاتە بە دڵی بێت‌و قەبووڵی بکات. سڵاوی زۆر هەژارانەی منی پێ بگەیەنەو دڵنیای بکە کە منەتباری ئەوم" لێم پرسی کێیە، وەڵامی دامەوە کە جەنابتان زۆر باشی دەناسیت.*

بە دڵێکی پڕ لە هەستی پێشبینییەوە هاوارم کرد:

*- ئەو پیاوە چ بیچم‌و هەیئەتێکی هەبوو؟.*

هەنگێ بیندل، موو بە موو کەوتە وەسفی کابرای شینپۆش بۆم، رێك بە و شێوەی کە لە گێڕانەوەکەی خۆتدا وەسفت کردبوو.

دەستەکانم هەڵگلۆفتن‌و هاوارم کرد:

*"ژارۆ ! ئەوە خۆی بووە!"*

ئەوسا هەموو شتێکی بۆ روون بووەوەو بەرە بەرە لە مەسەلەکە حاڵی بوو.

بە ترس‌و نیگەرانیەوە هاواری کرد:

*"ئەرێ، ئەو بوو، خۆی بوو! منی کوێر، منی شێت‌و گەوج، نەمناسییەوە،و خیانەتم لە ئاغای خۆم کرد!".*

فرمێسکی گەرمی ڕشت، کەوتە توندترین‌و تاڵترین سەرزەنشتی خۆی، خەم‌و پەژارەو داماویەکەی سۆزو بەزەیی وروژاندم. کەوتمە دڵدانەوەی، چەندین جار دڵنیام کرد کە زەرەیەك گومانم لە وەفاداری ئەو نیە،و بەلەز بۆ بەندەرم ناردو رامسپارد کە بە پێی توانا، هەنگاو بە هەنگاو دوای ئەو کابرا سەیرە بکەوێت‌و بە بست لێی دوور نەکەوێتەوە. بەڵام هەمان رۆژ گەلەکەشتییەکی گەورە کە بە هۆی دژەبا وبای ناسازەوە لە بەندەرەکەدا لەنگەریان گرتبوو، بەرەو شوێنانی دی، بەرەو کەنارێن دی، بە رێکەوتبوون،و کابرای شینپۆش هیچ شوێنەوارێکی لە دووی خۆی بەجێ نەهێشتبوو، وەکو سێبەرێك ون بوو بوو.

***پەراوێز:***

*1- دەبێ سەرنجی ئەوە بدرێ کە کابرایەکی نوقسان پەی بەوە دەبات کە شلمیل، سێبەری نیە.. واتە نوقسانێك پەی بە نوقسانیەکەی شلمیل دەبات.*

2- ئالبرشت ڤن هالر (1708– 1777) پزیشك و رووەکناسێکی سویسرایی بوو کە شیعرو ڕۆمانانیشی دەنووسی.

3- ئالکساندەر ڤن هومبولت، زاناو دۆزەرەوەو گەڕیدەیەکی بەناوبانگە، برای ویلهلم ڤن هومبولتی فەیلەسوف و سیاسەتوانە.

4- کارل ڤن لینە (1707– 1778) تەبیعیاتزانێکی سوێدیە، لە تیۆریسێنەکانی کۆ ئەندامی زاوزێی ڕووەکانە.

5- ئەڵقەی جادو: یەکێکە لە بەرهەمەکانی دولاموت فوکە (1812).

6- بیندل (Bendel): ناوی خزمەتکارە وەفادارو دڵسۆزەکەی شامسیۆ بوو لە کاتی جەنگی (1806) دا.

**کەسێك کە دیلو ئەسیری کۆتو زنجیر بێ، پەڕو باڵ بە کەڵکی چی دێت؟ جگە لە زیادکردنی ناکامیو نائومێدی ئەو، بەکاری هیچی تر نایەت. لە نێو زێڕەکانی خۆمدا، وەکو ئەژدیهای فافنەر* (Faffner) بەدیار گەنجەکانیەوە، لە هەر جۆرە دڵدانەوەیەکی مرۆڤانی بێبەشو، بوونەوەرێکی بەدبەخت و هەژارو بێنەوا بووم. نەك هەر خۆشم نەدەویست، بەڵکو وەکو سەبەبکارێکی تەنیایم لەم دنیایەدا، نەعلەتو نەفرینم بۆ دەنارد. لەو کاتەدا کە رازو نهێنییە خەمناکەکەم لە ناخو دڵی خۆدا دەشاردەوە، لە بەردەم کمترین نۆکەرانم دا دەلەرزیم،و لە هەمان کاتدا بەغیلیم پێدەبرد، چونکە بۆ خۆی سێبەرێکی هەبوو و دەیتوانی لەبەر هەتاودا دەربکەوێ. تەنیاو گێژوحۆل، شەو و رۆژم لە ماڵەکانی خۆمدا بەسەر دەبرد، خەمو پەژارە وەکو خۆرە دڵی دەخواردم.**

**یەکێکیش بە بەرچاومەوە لە خەمی مندا دەسووتا، ئەو یەکە بیندلی وەفادارم بوو. لەو روانگەیەوە کە بە خەیاڵی خۆی لە هەنبەر منداو دەرهەق بە من کەمتەرخەمی نواندووە، ژێراوژێرو بە بێدەنگی، بەردەوام خۆی سەرزەنشت دەکرد، چونکە نەیتوانی بوو ئەو پیاوە بناسێتەوە کە بە ئەمری من چوو بووە سۆراخی تا هەواڵێکیم بۆ بێنێو دەبوایە بیزانیبایە کە چارەنووسی خەمناکی من بەوەوە بەندە. بەڵام من بە هیچ کلۆجێ بە شایستەی سەرزەنشتم نەدەزانی: لەم رووداوەوە، تەبیعەتی مەتەڵ ئاسای ئەو کابرا نەناسەم بۆ دەرکەوت.**

**جا بۆ ئەوەی هەر رێگەیەکی رزگاری تاقی بکەمەوە، رۆژێ (بیندل)م بە موستیلەیەکی ئەڵماسی گرانبەهاوە بۆ لای بەنێوبانگترین نیگارکێشی شار ناردو تکام لێکرد بێت بۆ ماڵەکەم. هات. پێشخزمەتو خولامەکانی خۆم کردنە دەرەوە، دەرگام داخست، لە تەنیشتی نیگارکێشی گۆڕینەوە دانیشتمو، دوای ستایشو پێداهەڵدانی بەهرەو تواناکانی ئەو، بە دڵتەنگییەوە باسی گرفتەکەم بۆ کرد، بەڵام پێش ئەوەی هیچ قسەیەك بکەم، بەڵێنی پاراستنی تەواوی ئەم رازەم لێوەرگرت.**

**گوتم:**

***"حەزرەتی ئوستاد، ئایا دەتوانی، سێبەرێکی دەستکرد، بۆ مرۆڤێك کە بەشێوەیەکی یەجگار ناخۆشو پڕ سوێ سێبەرەکەی خۆی لە دەست داوە، دروست بکەی؟"***

***– مەبەستت لەو سێبەرەیە کە دەکەوێتە سەر ئەرز؟***

***– بەڵێ، هەڵبەتە ئەو سێبەرەم مەبەستە.***

***– باشە ئەو بنیادەمە لەبەر غەشیمی، لەبەر بێ موبالاتی، لەبەر خەمساردی، لەبەرچی سێبەرەکەی لە دەست داوە؟***

**بەرسڤم دایەوە:**

***– گرینگ نیە ئەمە چۆن روویداوە!***

ئیدی بەدەم درۆ ڕستنەوە، لەسەر قسەکەم ڕۆییشتم و گوتم:

*– لەگەڵ ئەوەشدا پێت دەڵێم کە زستانی رابردوو، لە کاتی سەفەرێکیدا، لە روسیا، سێبەرەکەی لە سەرمایەکی بەترەف و نائاسایی دا، بە جۆرێ لەسەر ئەرزەکە بەستی کە مەحاڵ بوو بتوانێ هەڵیگرێتەوەو لە ئەرزەکەی جیا بکاتەوە.*

ئوستاد، لەسەری ڕۆیی و گوتی:

*– من دەتوانم سێبەری دەستکردو ئەمانەتی بۆ دروستبکەم، بەڵام سێبەرێکی کاتی دەبێت و بە کەمترین جوڵە لە دەستی دەدات، بە تایبەتی ئەگەر ئەم کەسە، وەکو باستکرد، دەرهەق بەو سێبەرەی کە سروشت پێی بەخشی بوو، ئەوەندە خەمساردو بێ موبالات بووبێ. کەسێك کە سێبەری نەبێت، نابێت بێتە بەر هەتاو: ئەمە ئاقڵانەترین و باشترین ڕێگایە."*

نیگایەکی هێندە قووڵی کردم کە نەمتوانی خۆم لەبەردەمیدا ڕابگرم،و هەنگێ لە جێی خۆی هەستاو ڕۆیی. خۆم دا بەسەر کورسیە دەسکدارەکەمداو ڕووم لە نێو هەردوو دەستم نا.

بیندل، کە هاتە ژوورەوە، منی بەو وەزع و حاڵەوە بینی، دەردو خەمی ئاغاکەی خۆی بینی، دەیویست بەڕێزەوە بچێتە دەرێ. سەرم هەڵبڕی... خەم و پەژارەکەم هێندەی ئازار دەدا کە ناچار دەبوایە رازگرێك پەیدا بکەم.

بانگم کرد:

*" بیندل، بیندل، تۆ تاقە کەسی کە ڕەنج و ئازاری من دەبینی و ناتەوێ هۆیەکەی بزانی، بەڵام وادیارە لە ناختا هاوبەشی ئەو دەردو ئازارەی، وەرە پێشێ،و ببە بە رازگری نهێنییەکانی دڵم. نامەوێ بێ سنووری نەگبەتی و بەختڕەشی خۆم لە تۆ وەشێرم. بیندل، جێم مەهێڵە. کە داراو دەوڵەمەندو جوامێرو دڵاوا چاکەخوازم دەبینی، پێت وایە کە دەبێ کۆمەڵگە مەمنوونم بێت و ڕێزو قەدرم بگرێت، کەچی بەخۆت دەبینی کە من لە کۆمەڵگە هەڵدێم و خۆمی لێدەشارمەوە!.... بیندل، ئەم کۆمەڵگەیە حوکمی خۆی دەربارەم داوە، منی تڕۆ کردووە... تۆش لەگینە پاش ئەوەی بە رازە ترسناکەکەمت زانی، ڕووم لێوەربگێریت، پشتم تێبکەی. بیندل، من دەوڵەمەندو دەستودڵ کراوەو چاکەخوازم، بەڵام... خودایا!... من سێبەرم... نیە.*

ئەوکوڕی باشە بە ترسەوە هاواری کرد:

*– سێبەرت نیە!*

رونداك بە چاوانیدا هاتە خوارێ و گوتی:

*– هاوار بە ماڵم، واوەیلا بە حاڵم کە قەدەری من ئەوە بووە خزمەتکارو خوڵامی ئاغایەکی بێ سێبەر بم!".*

بێدەنگ بوو،و من ڕووخسارم لە نێو هەردوو لەپم نا. پاش بێدەنگیەکی زۆر درێژ، بە دەنگێکی لەرزۆك گوتم:

*" بیندل، هەنووکە سرم لە دەستی تۆ دایە،و دەتوانی لە قاوی بدەیت. بڕۆ،و خەبەرم لێبدە."*

وادیار بوو کە دووچاری کێشماکێشێکی دەروونی توند بووە، سەرەنجام بەسەر دەست و پێمدا کەوت و بە فرمێسکان دەستی تەڕ کردم و هاواریکرد:

*"نا، ڕەئی خەڵکی هەرچیەك هەیە بابێ، من ناتوانمو نامەوێ ئاغای دڵاوای خۆم، بە هۆی لە دەستدانی سێبەرەکەیەوە بە تەنیا بەجێ بێڵم، پشتی تێبکەم. من کە ڕاستگۆییو دروستکاریم، لە دووربینیم زیاترە، لای تۆ دەمێنمەوە، سێبەرەکەی خۆمت بە ئەمانەت دەدەمێ، ئەگەر بتوانم یارمەتیت دەدەم،و ئەگەر کاری وا مەحاڵ بێو هیچ کارێکم لە دەست نەیەت، لەگەڵ تۆدا دەگریم."*

حایرو سەرسام لەم بڕیارە، دەستم لە گەردنی وەرێنا، چونکە قەناعەتم کردبوو کە ئەم هەڵوێستەی زادەی زێڕ پەرستی نیە.

لەو ڕۆژەوە گۆڕانێك لە چارەنووسو چۆنیەتی ژیانم رووی دا. بیندل بە خەمخۆریو هەوڵو تەقەلایەکی لە وەسف بە دەرەوە، کاری بۆ شاردنەوەی ئەو عەیبو کێماسیە دەکرد کە بەرۆکی گرتبووم. بەردەوام لەگەڵ من، لە بەردەم مندا بوو، پێشبینی هەموو شتێکی دەکرد، ئاگای لە هەموو شتێك بوو،و هەستی بە بچووکترین مەترسی کردبا، خێرا سێبەرەکەی خۆی بەسەرا دەدامو دای دەپۆشیم، چونکە لە من باڵا بەرزترو زەلامتر بوو.

هەنگێ زاتم پەیدا کرد کە دووبارە تێکەڵاوی خەڵکی ببمەوە،و بەرە بەرە ڕۆڵێك لە کۆمەڵگەدا بگێڕم. ڕاستت دەوێ دەبوایە کۆمەڵێك ڕەفتارو ئەتواری غەریبو عەجیب بنوێنم، بەڵام ئەم ڕەفتارە غەریبانە هەر لە دەوڵەمەندان دەوەشێتەوە! تا ئەو کاتەی کە حەقیقەتەکە بە پەنهانی ماو ئاشکرا نەبوو بوو، زۆر بە قەدرو ڕێزو حورمەت بووم. بە هۆی زێڕەکانمەوە سەنگو ئیحتوبارێکی فرەم هەبوو. بە خەیاڵی ڕەحەت و بیری ئاسوودەترەوە چاوەڕوانی مەوعیدی دیداری ئەو کابرا نەناسو رازئامێزە بووم.

چاك دەمزانی کە نابێ لەو شوێنانەی کە بەبێ سێبەر بینرابوومو لەگێن بوو کە لە هەر ساتێکدا بناسرێمەوە، زیاد لە پێویست بمێنمەوەو ماتەڵ ببم. لەوەشە یەکەم کەس بم کە چوونی خۆمم بۆ خزمەتی جەنابی یون لە بیربوو و ئەم بیرەوەرییەم زۆر لا ناخۆش بوو. ئیدی تاقە شتێك کە من دەمویست ئەوە بوو کە لێرەدا بکەومە مەشقی ڕۆڵو دەورێك، تا بتوانم لە شوێنێکی دیکە بە ئاسانیو دڵنیاییەکی زیاترەوە ئەو ڕۆڵە بگێڕم. بەڵام نەفسم بۆ ماوەیەك ڕێی نەدام کە بڕۆم. ئا لێرەدایە کە لەنگەر بە قایمترین شێوە لە بنکی دەریای بوونی مرۆڤدا جێگیر دەبێت.

بۆ جاری سێیەم تووشی فانی جوان بووم، بەڵام هەرچی کرد بیری نەکەوتەوە کە لە عەمراتیدا منی دیتبێت، وێڕای ئەمەش بایەخێکی دامێ، چونکە ئێستا، ناسکی تەبعو هەستو فیراسەتو سەرناسیم هەبوو. کاتێ کە قسەم دەکرد، گوێیان لە قسەکانم دەگرت،و خۆمیش نەمدەزانی هونەری ئەم قسە ڕەوانو گفتوگۆیەم چۆن بە دەست هێناوە.

ئەو کارەی کە بە مەزەندەی خۆم لە دڵی ئەم شۆخەم کردبوو، ئەوەبوو کە بە کەیفی دڵی خۆی، دێوانەی کردم،و ئیدی، وێڕای هەزارو یەك مەترسیو خەتەر، لەبەر سێبەرو بوڵێلانەوە دەستم لە تاقیبو سۆراخی هەڵنەگرت. هەموو زیکرو فیکرم لای ئەوە بوو کە چۆنی بێنمە ڕەدا و بە منەوە بنازێت، سەرباری هەموو مەیلو حەزێکم، نەمتوانی سەرمەستی خۆم لە مەیدانی سەرەوە بۆ مەیدانی دڵ بگوازمەوە.

بەڵام بە چ دەچێت کە سەربهوردێکی ئاوها سواو و بێ بایەخ بە تول‌و تەفسیل‌و موو بە موو بۆ تۆ بگێڕمەوە؟ تۆ خۆتیش زۆر جار لەم جۆرە چیرۆك‌و نەقلانەت، کە بەسەر خەڵکانی باش‌و سەر راست‌و دروستکاردا هاتووە، بۆ گێڕاومەتەوە. وێڕای ئەمەش، ئەمجارەیان ئەو شانۆنامە تەقلیدی‌و بێ بایەخەی کە من لەبەر ساویلکەیی‌و خۆشباوەڕی خۆم، رۆڵێکی زۆر کۆن، بە کۆنی دنیام تیا قەبووڵ کرد بوو، کۆتاییەکەی، کۆتاییەکی تازەو دوور لە چاوەڕوانی‌و پێشبینی هەموو کەسێك بوو.

شەوێك کە وەکو عادەتی خۆم، کۆمەڵێکم لە باخێکدا کۆ کردبووەوە، دەگەڵ فانی دا کە قۆڵی بە قۆڵدا کردبووم، کەمێك دوور لە میوانەکان، خەریکی پیاسە بووم. بێ فیزو خاکیانە سەری دانەواند بوو. لە ناکاو مانگ لە پشتمانەوەو لە ئامێزی هەورانەوە دەرکەوت،و فانی جگە لە سێبەرەکەی خۆی، هیچ سێبەرێکی تری نەبینی. کەوتە لەرزین، سەرسام‌و نیگەران روانیە سەرو سیمام، پاشان سەر لە نوێ چاوانی بڕییە عاردەکەو کەوتە گەڕان بە دووی سێبەرەکەی مندا. ئەوەی لە ناخیدا رووی دەدا، بە شێوەیەکی هێندە سەیرو عەجیب بە روویەوە بەرجەستە بوو کە ئەگەر لەرزێکی وەکو بەفر ساردو تەزی لە سەراپام نەنیشتبووایە، لەوە بوو لە هەر ئان‌و ساتێکدا لە قاقای پێکەنین بدەم.

دەستی بەردام‌و بورایەوە. وەکو تیر بە نێو میوانە شپرزەو ترساوەکانمدا بۆی دەرچووم، گەییمە بەر دەرگاکە، خۆم تەپاندە ناو یەکەم گالیسکەوە کە هات، بە هەشتاو بۆ شار گەڕامەوە کە بۆ نەگبەتی (بینـدلی) سەرناس‌و بەردەبارو دووربینم لەوێندەر بەجێ هێشتبوو و رۆییشتبووم. بە دیتنی سەرو سیمای من کەوتە لەرزین، تاقە وشەیەك لە هەموو شتێکی ئاگادار کردەوە. یەکسەر کەوتمە رێ. جگە لە یەکێك لە نۆکەرەکانم بەناوی راسکال* ، کە زۆڵ‌و شەیتانی وەکو خۆی نەبوو،و بەو زەبەردەستی‌و لێزانیەی خۆی بوونی خۆی لێ کردبووم بە پێویست‌و زەروری،و کەمترین ئاگای لەو بویەرە نەبوو کە رووی دابوو، کەسی ترم لەگەڵ خۆدا نەبرد. هەر ئەو شەوە نزیکەی سی میلێك رێگام بڕی. بیندل، بە مەبەستی ڕاگەییشتن بە کاروبارەکانی من‌و دابەشکردنی زێڕو هێنانی شتی پێویست بۆ من، لەوێ مایەوە. بۆ سبەینێ کە خۆی گەیاندمێ، خۆم هاویشتە باوەشی‌و بەڵێنم دا کە جارێکی دی کاری خۆسەری نەکەم‌و لەوەدوا بە پارێزترو دووربین تر بم. بێوەستان تا مەرزو کێوان درێژەمان بە سەفەری خۆدا. پاش ئەوەی پێمان نایە ئەو دیوی کێوەکەو سەیرم کرد لە سایەی ئەم حەسارە بەرزەدا لەو سەرزەمینە نەفرەتبارە دوور کەوتوومەتەوە، رازی بووم کە لە گوندێکی قەراخ کانیاوە گەرمەکان کە لەو ناوە بوو و لا چەپ‌و تەریك بوو، زۆر سەرە رێگا نەبوو لا بدەم‌و ماندوویەتی دەربکەم‌و بحەسێمەوە.

***پەراوێز:***

****- فافنەر: ئەژدیهایەکە کە پاسەوانی گەنجینەکەی شانیبلونگ بوو و بە دەستی زیگفرید کوژرا.***

***- راسكال: وشـەیەكی ئینگلیزیمان وەبیر دێنێتـەوە كـە مانای كلاَوچی، فێڵباز و شـەلاتی دەگەیەنێت.***

ناچارم كە زۆر  بە خێرایی بەسەر قۆناغێكی سەربهوردی خۆمدا تێ بپەڕم كە ئەگەر زاكیرە بە هانامـەوە هاتبـاو ئەفسـوون و دڵرفێنیەكـەی وەیـاد هێناباومـەوە، لـەزەتێكی زۆرم لـە گێڕانـەوەو دووپاتركردنەوەی دەبینی. بەڵام ئەو رەنگانەی كە روحیان دەدایی و گیانیـان وەبەر دەخست و دەیانتوانی ژیانێكی تازەی پێ ببەخشن، لە مندا پوكاوەتەوە،چرمسیوە و كاتێ كە هەوڵدەدەم كە لە سینەو دڵ و دەروونمدا ئەو هەستانە، ئەو كەیف و شادی و خۆشیانە،و ئەو ئازارو رەنج و خەیاڵ و وەهمە سۆفیانەیەی كە لە رابردوودا بەو توندیە دەیانهێنایە لێدان بدۆزمەوە، ئەوا لە تاوێرێـك دەدەم كـە هـیچ سەرچـاوەیەكی ژیـانی"1"* لێـوە نایەتـە هـەڵقوڵین، ئـاو لـە دنگـا كوتانـە.خـودا لـێم دوور كەوتووەتـەوە، پشـتی تێكـردوم، ئـەو زەمـان و رۆژگـارەی كـە هەنووكـە مردووەو رۆییوە، بە چ شێوەگەلێكی جۆراو جۆر لە بەردەممدا دەردەكەوێ!

بە تـەمابووم كـە لـەم بەینـەدا رۆڵێكی قارەمـانی، حەماسی بگێڕم، بـەڵام منی بێ ئـەزموون و تازەكار، لە رۆڵ و سنووری خۆم هێوەتر دەڕۆم و ئاشق و شەیداو ئەفسوونی دووچای شین دەبم! باب و داك كە لەم گەمەیەی من بێزارو نا ئومێد بوون، خودا خودایانە لە كۆڵی خۆیـانم بكەنـەوە،و كۆمیدیا ناهەموارەكە بە فێڵ و نێرەنگێك كۆتایی دێت.

ئەوەندەو بەس. ئەوەندەو بەس! ئەمڕۆكـە ئـەم شـتانە بێ مانـاو پێكـەنیناوی دێنـە بەرچاوم،و لەلایەكی ترەوە ئەم جۆرە داوەرییە دەربـارەی شـتێك كـە لـەوێ رۆژگـاردا بـەو توندیـە دڵـی دێنامـە لێدان، یەجگار خەمناكە.

ئەی مینا*"2"* ! وەكو چۆن لە كاتی خۆیدا، لە رۆژگاری ڕابردوودا، بۆ لـە دەست دانت گریام، ئێستاش بۆ ئەوە دەگریم كە ناتوانم لە خۆمدا بتدۆزمەوە. یانی ئەمەنـدە پیر بوومـە؟! ئەی ئـەقڵی بێنەوا! تەنیا یەك تروسكە لەو رۆژگارە، تەنیا یەك دەقیقە لـەو خەیاڵـە... بـەڵام نـا، هـەیهات، ئـەی ئـەقڵ، مـن بەسـەر شـەپۆلە پـڕ ئازارەكـانی تـۆوە تـەنیام،و لـە دێرزەمانـەوە، دوا بـۆنی شـەرابی مەستیاوەر رۆییوەو نەماوە.

(بینـدل)م لـە پێشـەوە، بـە چـوار پێـنج كیسـە زێـڕەوە نـاردبوو تـا مـاڵێكم، بـە گـوێرەی پێویستییەكانی خۆم، بۆ فەراهەم و ئامادە بكات. ئەو زێڕە زۆرەی كە بەخشـی بویـەوەو ئـەو قسـە نامەفهومانەی كە دەربارەی بێگانەیەكی دیار، كە ئاغاكـەی بـوو، كردبـوونی (چونكە نەمدەویست نـاوم بزانێـت) تەسـەورو وێنایـەكی عـەجیب و غـەریبی لـە نێـو خـەڵكی باشـی ئـەو بازێڕوكـەدا دروستكردبوو. هەركە ماڵەكەم ئامادە بوو، بیندل بە شوێنمدا هات و بەڕێ كەوتین.

لە نزیكی یەك فەرسەخی شاردا، لە شوێنێكی هەتاوگیردا، ئاپۆرەیـەكی فرە، بە جل و بـەرگی جەژنەوە، رێگایان لێگرتین، گالیسـكەكە وەسـتا. مۆزیـك، نـەوای زەنـگ و ناقوسـان، گرمـەی گوللـە تۆپـان هـەموو تێكـەڵ بـوون، هـوڕای بـا بـژیی پـڕ جـۆش و خرۆشـان، ئاسمانیـان شـەق كـرد. دەستەیەك كیژی سپی پۆش هاتنە بەر دەرگـای گالیسكەكە، هـەموویان زۆر جوان بـوون، بـەڵام

جوانییەکەیان لە هەنبەر جوانی یەکێك لە هاوڕێکانیان، وەکو ستێرانی شەو لە هەنبەر هەتاودا، ئاوا دەبوو و دیار نەدەما. ئەم ئافەریدە زۆر جوان‌و ناسك‌و نازدارە لە پێش هەموویانەوە نزیك بووەوە، لە شەرما سوور هەڵگەڕابوو، کڕنۆشی بۆ هێنام،و لەسەر نازباڵنجێکی ئاوریشم، تاجە گوڵینەیەکی پێشکەش کردم کە بریتی بوو لە چڵی دار غارو زەیتون‌و گوڵەباخ،و بە دەم ئەو کارەوە خێرهاتنێکی کردم کە زاراوەی حەزرەت‌و شان‌و شەوکەت‌و قەدرو حورمەت‌و مەحەبەتی لە خۆ گرتبوو. من لە مانای ئەوە نەگەییشتم، بەڵام ئەو دەنگەی کە لەم خێرهانینەدا بەکار دەبراو دەنگدانەوەیەکی وەك زڕەی زیوی هەبوو، گوێ‌و دڵی سەر مەست کردم، لەوە دەچوو ئەم سیما ئاسمانیە پێشتر بەلامدا تێپەڕی بێت. کۆرسی گۆرانی دەستیان پێکرد. سروودی ستایشی پاشای میهرەبان‌و بەختەوەری میللەتەکەیان گوت.

ئەم دیمەنە، دۆستی ئازیز، لە هەڕەتی هەتاودا ئەنجام دەدرا! ئەو هێشتا لە دوو شەقاوی مندا بە چۆکا هاتبوو، و من کە لە سێبەرو سایەی خۆم مەحرووم‌و بێبەش بووم، نەمدەتوانی بەم مەسافە کورتەدا تێپەڕم، بەسەر پێی ئەم فریشتە ئاسمانیەدا بکەوم! ئاه! لەو ساتەدا ئامادەبووم، هەرچی دارو نەدارم هەیە بە سێبەرێکی بدەم، تەنیا سێبەرێکم هەبێ‌و بەس! ناچار بووم کە نەنگی خۆم، پەرێشانی خۆم، نامرادی خۆم لە قوڵایی گالیسکەکەدا وەشێرم. ئەنجام بیندل لە جیاتی من قەراری دا. لە دەرگاکەی تری گالیسکەکەوە دابەزی. گازم کردو لە سەندوقۆکەکەی خۆمدا، تاجێکی ئەڵماسی گرانباییم، کە کاتی خۆی بۆ رازاندنەوەی تەوێڵی فانی شۆخ دانرا بوو، دەرهێنا تا بیداتە ئەو. بیندل بە دەم پێشقەچوونەوە بە ناوی ئاغای خۆیەوە قسەی دەکرد، گوتی کە من نەدەتوانم‌و نە دەمەوێ ئەم جۆرە مەحەبەت‌و هەستە قەبوول بکەم، بەڵام وێڕای ئەمەش منەتباری لوتف‌و نیازچاکی خەڵکی شارم. ئەو تاجە گوڵینەیەی، کە بۆ من هێنرا بوو، لەسەر نازباڵنجەکە هەڵگرت‌و نیو تاجەکەی لە شوێنی دانا. ئەوسا بەڕێزو حورمەتەوە دەستی دایە دەست کیژە جوانەکە تا لە عاردی هەڵیسێنێ،و بە ئاماژەیەك داوای لە کاهێنان‌و دەمسپیان‌و شاندەکان کرد کە بڕۆن. ئیدی رێگە نەدرا چ کەسێك نزیك ببێتەوە. دەستووری بە ئاپۆڕەی خەڵکەکەدا کە رێگا بۆ گالیسکەکە بکەنەوە، سواری گالیسکەکە بووەوەو بە یۆرغە بەرەو شا وەڕێکەوتین‌و بە ژێر تاقێکی رازاوە بە چڵ‌و گوڵاندا تێپەڕین. گرمەی تۆپ نەدەوەستایەوە. گالیسکەکە لەبەر ماڵەکەمدا وەستا: درم بە ئاپۆڕەی ئەو خەڵکانە دا کە تاسەی دیداری من بۆ ئەوێندەری هێنا بوون،و بە هەشتاو بەرەو دەرگا تەکانم دا. جەماعەت لە ژێر پەنجەرەکەمدا، کە لەسەرێ را سکەی زێڕم بە سەریاندا دادەباراند، هوڕای با بژییان دەکێشا. شەوێ، شار بەوپەڕی شادی‌و خۆشییەوە بوو بە چراخان.

هەڵبەتە نەمدەزانی بۆچی ئەم کارە دەکەن‌و بە کێم تێگەییوون.

(راسکال)م بۆ تاقیب‌و سۆراغ نارد. پێیان گوتبوو کە لەسەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە زانیویانە کە پاشای پروسیا بە ناوی کۆنتێکەوە لە وڵاتا سەرقاڵی سەفەرە، کە گاردەکەم ناسراوەتەوەو پەردەی لە رووی ناوونیشانی نهێنیم هاڵماڵیوەو لاداوە،و بە کورتیەکەی کە بە بوونی منیان لێرە زانیوە، زۆر خۆشحاڵ بوون. ئێستا کە ئاشکرا بووە کە من دەمەوێ بە نەناسی‌و وەمێنم‌و کەس

پێم نەزانێت و نەمناسێت، لەم کارەیان کە بەناهەق و لە ناکاودا پەردەیان لە رووی من لاداوە، پەشیمانن. وێڕای ئەمەش، ناڕەحەتی و نیگەرانیم هێندە نیشانەو شوێنەواری بەردەباری و مێریڤانی و لێبوردەیی و لوتف و مەرحەمەتی پێوە دیار بووە کە هیوادارن، لە دڵەی چاك و میهرەبانیان ببورم.

نۆکەرو خولامە ناڕەسەنەکەم ئەم شتەی هێندە بەلاوە خۆش بوو. کە کەوتە لۆمەیان،و پیێ بە پێی ئەم گازاندەو گلەییە، هەرچیەکی لە تواناد بوو بە کاری برد تا کارێك بکات کە ئەم خەڵکە باشە هێندەی دی لەسەر بیروباوەڕەکەیان مکوڕتر بکات. هەواڵێکی زۆر کۆمیدی بە من دا،و کە سەیری کرد ئەم حیکایەتە سەرگەرمم دەکات، بە ڕادەیەك شولی لێهەڵکێشا کە شانازی بەو نامەردی و ناپیاوییەوە دەکرد کە بەکاری بردبوو. دەبێ ئیعتراف بکەم؟ پیاو ڕاست بڕوات چونکە بە کەسێکی ناودارم تێگەیی بوون،و وایان دەزانی من ئەو کەسە ناودارەم ،لە دڵی خۆدا هەستم بە جۆرە شانازی و غرووڕێك دەکرد.

دەستوورم دا کە بۆ سارەشەو، لە سێبەری ئەو دارو درەختانەی بەر ماڵەکەمدا، ئاهەنگێك ساز بکەن کە هەموو شاری بۆ بانگهێشت بکرێ. تواناو دەسەلاتی پەنهانی هەنبانەکەم، هەوڵ و تەقەللای بیندل و کارو کۆششی زەبەردەستانەی راسکال، بەسەر زەمانیشدا زاڵ بوو. هەموو شتێك لە زەرفی سێ چوار سەعاتاندا، بە تێرو تەسەلی و شکۆیەکی بەڕاستی شایانی ستایش و ئافەرین، ئامادەکرا. بەڕاستی کالا لە قەد بالا بوو. چراخانی کۆڕو ئاهەنگەکە هێندە هونەرمەندانەو تەڕدەستانە بوو کە بە تەواوەتی دڵ رەحەت و ئاسوودە بیر بووم. لە هەموو روویەکەوە جگە لە ئافەرین نەمدەتوانی هیچ شتێکی دی بە خولامەکانی خۆم بڵێم.

شەو داهات، میوانان پەیدا بوون، رێو رەسم و داب و نەریتی تەعاروف ئەنجام درا. چیتر زاراوەی خاوەنشکۆو پایەداریان بە زاردا نەهات، بەڵکو بەوپەڕی رێزو حورمەتەوە بە جەنابی کۆنت ناو دەبرام. چارم چیە؟ ئەم لەقەبەم قەبوڵکرد،و لەو ساتەوە بووم بە کۆنت پیتەر. لە گەرمەی ئاهەنگەکەداو لە نێو هەموو ئاهەنگ گێڕاندا، روحم ئارەزووی یەك کەسی دەکردو بەس. ئەو درەنگ هات، ئەوەی کە خۆی تاج بوو، تاجیشی لەسەر بوو! بە شێوەیەکی خاکیانە، دەگەڵ باوك و دایکی دا بوو، و لەوە دەچوو کە خۆی نەزانێت کە لە هەمووان جوانترە. زەمینەی ئاشناییم دەگەڵ ئەندازیاری جەنگەڵوانی و ژن و کیژەکەیدا خۆشکرا. توانیم هەزارو یەك شتی میهر ئامێزو دڵنەواز بە دایك و باوکی بڵێم، بەلام لە هەنبەر کیژێدا وەکو قوتابیەك بە قۆپیەوە گیرا بێ، زمانم چووە کلیلەوەو تاقە یەك وشەم بۆ نەهات، سەرەنجام، بە مینگە مینگ، داوام لێکرد کە بۆ خۆشی و سەرفرازی و گەرمکردنی مەجلیس و کۆڕی ئاهەنگەکە نەخش و دەورێ بگێڕێ، کە ئەو تاجەکەی سەری بکاتە ملی. بە نیگایەکی هەراسان و دڵڕفێنەوە داوای کرد کە ئەو ئەرکەی نەخەمە ئەستۆ. بەلام من کە لەو شپرزەترو پەرێشانتر بووم، وەکو بەندەو کۆیلەی ئەڵقە لە گوێی ئەو، گوێڕایەڵی و ملکەچی خۆم لە بەردەمیا نواندو ئەم رەفتارو کردارەی من بەرانبەر بەو یەکسەر بوو بە دروشمی هەموو میوانەکان. شکۆو پاکیزەیی و بێگەردی و لوتف و ناسکی و روح سووکی و ڕەزا سووکی دەگەڵ شۆخی و جوانیدا تێکەڵ بوون و ئاهەنگێکی خۆشیان سازاند.

دایكو باوكی بەختەوەری مینا، زۆریان كەیف بەو حورمەتو ڕێزانەی كە لە كیژەكەیان دەنرا، دەهات. گەز گەز باڵایان پێدەكرد. من بە خۆم ئەوەندە خۆشحاڵ بووم كە لە وەسفكردن نەدەهات. فرمانم دا هەر هەموو ئەو جەواهێراتو مرواریو ئەڵماسانەی كە كاتی خۆی بە مەبەستی لە كۆڵكردنەوەی زێڕەكانم كڕی بوومن، بخەمە سەر دوو سینی سەر داپۆشراو،و فرمانم دا كە لە سەر سفرەكە، بە ناوی شابانۆوە (مەلیكە) بە هەموو خانمان بدرێت. لە هەمان كاتدا، لەسەر ئەو پەرژینانەوە كە بەرزكرابوونەوە، لە پەستاو بێوچان زێڕ بەسەر ئەو جەماعەتەدا هەڵدەدرا كە كردبوویان بە قریوە قریوی شادمانیو خۆشی.

سبەی بەیانی، بیندل بەو مەرجەی كە ئەم رازە لە بەینی خۆمانا بمێنیٚ، ئاگاداری كردمەوە كە ئەو گومانو شكو دوو دڵیو دڕدۆنگیەی كە دەمیٚ بوو لە دروستكاریو سەر ڕاستی راسكاڵی پەیدا كردبوو، ئاقیبەت تەواو دەرچوو. گوتی:

**"دوێنیٚ بە چاوی خۆم. دیتم كە خەریكی دزینی چەند كیسەیەكی پڕ لە زێڕ بوو."**

بەرسڤم دایەوە:

***- وازی لێبێنە با ئەم بەستەزمانەش چكێكی لەم دەسكەوتە ناچیزە پیٚ ببڕیٚ، من هەر بە ئارەزوو و بۆ كەیفی دڵ بە خەڵكی دەدەم، بۆچی بە ویشی نەدەم؟ دوێنیٚ، وەكو هەموو ئەو پێشخزمەتو خزمەتكارانەی كە تۆ تازە بۆ خزمەتی ئەم ماڵەت هێناون، زۆر بەباشی خزمەتی كرد. هەر هەموویان بۆ ئەوەی كۆڕی ئاهەنگەكە بە خۆشیو شادی بەڕێوە بچێت، یارمەتی یەكتریان دا.***

ئیتر ئەم باسە نەهاتەوە ناو ناوان. راسكال بوو بە گەورەی دەستوپێوەندو خزمەتكارەكانم، بەڵام بیندل دۆستو رازگری من بوو. بەوە ڕاهاتبوو كە سەروەتو سامانەكەی من بەو چاوە تەمەشا بكات كە سنوورو كۆتایی نیە،و هیچ هەوڵێك بۆ زانینی سەرچاوەی ئەو سەروەتو دەوڵەتە نەدات. دەگەڵ بیروبۆچوونەكانی مندا دەسازا، زیاتر یارمەتی دەدام كە فرسەتو دەلیڤان پەیدا بكەم تا ئەم بیروئەندێشانە ئاشكرا بكەمو زێڕەكەم بیٚ هیچ رەزیلییەك تەخشانو پەخشان بكەم. بەڵام دەربارەی كابرای نەناس، ئەو زمان لووسەی ماستاوچیە، دەبیٚ ئەوە بڵێم هەر ئەوەندەی دەزانی كە من تەنیا بە دەستی ئەو دەتوانم لەو نەحلەتو نەفرەتەی كە بە دەستیەوە دەم ناڵاند، رزگار ببم، كە لەو ، كە تاقە مایەی ئومێدم بوو دەترسم،و چونكە دەزانم كە ئەو، بە پێچەوانەی منەوە، دەتوانیٚ لە هەموو شوێنێك بمدۆزێتەوەو پەیدام بكات، ئیدی ناچار چاوەڕوانی ئەو رۆژەم.

شكۆو جەلالی دەعوەتو ئاهەنگەكەمو رەفتارو كردارم لە سەرەتای كارەكەوە، خەڵكە سادەو خۆشباوەڕەكەی شاری، هێندەی دی لەسەر باوەڕی هەوەڵینی خۆیان مكوڕ كرد. قەناعەتی هەوەڵینیانی زیاتر چەسپاند، بەڵام رۆژنامەكان، زۆر زوو كەوتنە بە درۆخستنەوەی سەفەری مەوهوومی پاشای پروسیا. بەڵام منیان كردبوو بە پاشایەكی دوو ئاتەشە،و دەبوایە وەكو داراترینو بەهێزترین پاشا خۆم بنوێنم. تاقە شتێك كە لە ئارادا بوو، ئەوە بوو كە بە تەواوەتی نەیاندەزانی دەبیٚ كام پاشا بم. دنیا هەرگیز بەهانەی كەمی پاشای نەبووە، خۆ لە سەردەمو رۆژگاری ئێمەدا كەمتر لە هەر سەردەمو رۆژگارێكی دی ئەم بەهانەیە هەیە.

ئەم خەڵکە باشە کە هیچ پاشایەکیان بە چاوی خۆ نەبینی بوو، بە تاسەو لەزەتێکی زۆرەوە، جارێ بەو پاشاو جارێ بەم پاشایان دەزانیم.کۆنت پیتەریش وەکو خۆی هەر هەمان کۆنت پیتەرە کە هەبوو.

رۆژێ لە رۆژان بازرگانێك بە گەرمو گوڕی هاتو لە ڕای دەوڵەمەند بووندا نابووت بوو بوو. مایەی ڕێزی خەڵکی بوو، سێبەرێکی هەبوو ئەگەرچی تۆخ نەبوو، بەڵام سێبەرێکی گەورەو پانو پۆڕ بوو. دەیویست ئەو سەروەتو سامانەی کە کۆی کردبووەوە ، لێرەدا بە شێوەیەکی شکۆدارو حیرەتبار خەرج بکات،و کەڵکەڵەی ئەوەی کەوتە سەر کە رکابەری من بکات. بەڵام من دەرکی هەنبانەکەم کردەوەو ئەو بەڵەنگازەم بە جۆرێ ماڵوێران کرد، کە لە ڕای پاراستنی سەنگو ئابڕووی خۆی ناچار دووبارە نابووت بوو و بە کێواندا سەرکەوتو رۆیی. بەمجۆرە لە کۆڵم بووەوە. ئاه! چەندم ناکەسو هەتیوچەو بێکارەو بەرەڵلا، لەم مەملەکەتەدا هێنایە ئاراوە!

بە هەموو ئەو شکۆو دەبدەبەو تەنتەنەو دڵاوایی‌و جوامێرییە بە حەقیقەت شاهانەیەوە، لە ماڵەکەی خۆمدا یەجگار سادەو زۆر تەریكو گۆشەگیرانە دەژیام.

دووربینی‌و دوورەپەرێزیم کردبوو بە رێساو یاسای خۆم: جگە لە بیندل هیچ کەسێکی دی، بە هیچ بیانوویەکەوە هەقی ئەوەی نەبوو بێتە ماڵە تایبەتیەکەم. کاتێ خۆر هەڵدەهات، دەگەڵ ئەودا، دەرگام لەسەر خۆم دادەخست،و دەیانگوت: ***"کۆنت لە نووسینگەو ئۆفیسەکەی خۆیدا مژولی کارە"***. ئەو هەموو نامانەی کە دەربارەی کەمترین تووڕەهات دەمناردن وبۆم دەهاتن، بەڵگەی زندووی ئەم کارە بوو. جگە لە شەوان، ئەویش لە باخەکە یان ساڵۆنەکەی خۆمدا، کە بە سەرپەرشتی بیندل زۆر شاهانەو لێزانانە دەکرا بە چراخان، هیچ هاودەمو هاوبەزمێکم نەدەبینی. کاتێ کە دەچوومە دەرێ چاوە ئارگۆس"3" ئاساکانی بیندلی تاین بەردەوام بە دوامەوە بوو و چاودێری دەکردم،و دەبێ ئەوەش بڵێم کە چوونە دەرەوەم هەمیشەو تەنیا لە پێناوی ئەوەدا بوو کە بۆ باخەکەی یارۆی سەرپەرشتیاری جەنگەڵوانی بڕۆم. پیاو ڕاست بڵێ ئەشق‌و ڤیانی کیژەکەی ئەو هەموو ژیانی فەتح کردبووم.

ئەی شامیسوی مێریڤانم! هیوادارم هێشتا بیرت مابێ ئەشق چیە،و ئیدی بۆ خۆت بە تەنیا بڕۆ... مینا، ئەلهەق شایستەی مەحەبەتو ڤیان بوو، باشو نازەنین بوو. بە هەموو تەوازوعێکی خۆیەوە پێی سەیر بوو کە شایستەی ئەوە بێت من چاوی تێبڕم،و لە کانگای دڵێکی پاکەوە وەڵامی مەحەبەتی بە حەمەبەت دەدایەوە. بەو بوایە گیانی خۆی بەخت بکات، خۆی فەرافۆش دەکرد، جگە لە ئاشقەکەی کەسی تری لە بیر نەبوو، بێمنەت بوو لەوەی بەپەلە بەرەو فەوتانی خۆی دەڕۆیی...و بە کورتیەکەی، ئاشق بوو.

من — لەو ساتەوە کە لە یەکەمین خۆشی‌و سەرمەستی خۆم وەئاگا هاتمەوە لە فکران ڕاچووم کە ساتگەلێکی ترسناك، ترسناكو لە هەمان کاتدا مایەی داخو حەسرەت بوو، سەرم کردە گریانو فرمێسك ڕشتن! منی مەحرومو بێ بەش لە نیعمەتی سێبەر، لە ڕێگەی درۆو کەڵەکەوە، بە خۆپەرستیەکی نارەوایانەو زاڵمانە، ئەو روحە پاکە، ئەو فریشتەیەم بەرەو لای خۆم رادەکێشا! هەندێجار دەمویست رووی راستەقینەی خۆمی بۆ دەربخەم، هەندێجار بەڵێنم بە خۆ

دەدا کە دەستبەرداری ببمو هەڵیم، یان دووبارە دەگریامو فرمێسکم دەڕشت،و دەگەڵ بیندل دا بیانوویەکم دەدۆزییەوە تا ئەو لە باخەکەی بابیدا بدینم.

لە هەندێ ساتی دیکەدا ئومێدێکی زۆرم بە دیداری ئایندەی یارۆی نەناسی شینپۆش پەیدا دەکرد، بەڵام پاش ئەوەی بێهودە دەکەوتمە هەوڵو تەقەلا تا بە خەیاڵی خاوی خۆم بەو ئاواتە بگەم، لە هۆڕژنی گریانم دەدا. ئەو رۆژەم، کە بە ئومێدی دیتنی بووم، لای خۆم دیاری کردبوو، چونکە گوتبووی: "لە ئەمڕۆوە تا یەك ساڵی دی! باوەڕم بە قسەی هەبوو".

باب و دایکی مینا، ساڵمەندانێکی دڵو دەروون باشو مێریڤان بوون کە تاقە کیژەکەیان تا رادەی پەرستن خۆشدەویست. ئەڤینداری ئێمەیان، بەر لەوەی لێی ئاگاداربن، بەلاوە سەیر بوو و نەیاندەزانی چ بکەن. تا ئەو ساتە هەرگیز ئەوەیان بە خەیاڵو مێشکدا نەهاتبوو کە لەگینە کۆنت پیتەر لە بیری ئەودا بووبێ. کەچی ئێستا شەیدای ئەو بوو بوو. دایکی بە رادەیەك ئەمەی پێخۆش بوو کە گیرۆدەی وەهمی ئەگەری ویساڵ بوو بوو،و کاری بۆ دەکرد. بەڵام ئەقڵی ساغڵەمو دروستی پیرەمێردەکەی بابی ئەو جۆرە پایەخوازیو بەرزەفڕییە شێتانەیەی نەدەبڕی.

هەردووکیان باوەڕو متمانەیان بە پاکی هەستەکانی من هەبوو، هیچ کارێکیان لە دەست نەدەهات، تەنیا ئەوە نەبێ کە دوعای خێر بۆ کیژەکەیان بکەن.

ئەو نامەیەم، کە مینا لەو سەروبەندەدا نووسیویەتی، دەست کەوتووە. بەڵێ دەست خەتی ئەوە! حەز دەکەم دەقی نامەکەت بۆ بنووسمەوە:

"کیژۆڵەیەکی بەلەنگازم کە دنیایەك هزرو خەیاڵی شێتانەم لەسەردایەو وا تەسەور دەکەم کە خۆشەویستەکەم چونکە بە میهرەبانی، بە میهرەبانی خۆشم دەوێ، ناخوازێ هیچ ئازارێك بەو کیژۆڵە بێنەواو بەلەنگازە بگەیەنێت. ئاه! تۆ یەجگار مێرێڤانی، لە مێریڤانیدا هاوتات نیە! بەڵام باش گوێ بگرەو بزانە چی دەڵێم، تۆ نابێ هیچ شتێك بکەی بە قوربانی من،و نابێ بەو نیازە بیت شتێك بکەی بە قوربانی من، خودایا! ئەگەر کاری وا بکەی، ڕقم لە خۆ دەبێتەوە، نەفرەت لە خۆ دەکەم. نا، تۆ لە ڕادەبەدەر بەختەوەرت کردووم، رێگەی خۆشەویستیت فێر کردووم. بڕۆ! من ئاگام لە چارەنووسی خۆم هەیە: کۆنت پیتەر هەر هی من نیە، موڵکی هەموو دنیایە. بە فەخرو شانازیەوە ئەم قسەیە لە زاری خەڵکییەوە دەژنەوم: ((خۆی بوو، هەر خۆی بوو...و ئەم کارەی کرد... لێرە پەرسترا، لەوێندەر گەیەنرایە پایەی خوایەتی.... دەزانی کاتێ بیر لەم شتانە دەکەمەوە،و هەستدەکەم لەوەیە چارەنووسی بەرزی خۆت لە پاڵ کیژێکی بەلەنگازدا فەرامۆش بکەی، لێت زویر دەبم. بڕۆ، ئەگینا ئەم بیرە، لە ئەنجامدا بەختەوەری من، کە لە سایەی سەری تۆوە ئەوەندە شادو ئەوەندە بەختەوەرم، لە ناو دەبات. مەگەر چڵە زەیتوون وخونچە گوڵێکم ئاوێتەی ژیانی خۆم نەکردووە، وەکو چۆن بەو تاجەوەم کرد بوو کە ئەنجام زاتم کردو پێشکەش بە تۆم کرد؟ تۆ ئەی مەحبوب و خۆشەویستی من، لە دڵی منداى، لە ناو دڵی مندایت! کەواتە هیچ خەمو ترسێکی دوورکەوتنەوەو جیابوونەوەت لە من نەبێت! لە سایەی بەرەکەتی سەری تۆوە زۆر بەختەوەرانە، بەڵێ یەجگار بەختەوەرانە دەمرم"4"))

جا بە خۆت وێنای بکەو بزانە ئەم چەند دێڕە چەند دڵی پارچە پارچە کردووم.

بە مینام گوت کە من ئەو کەسە نیم کە تەسەور دەکرێت، راستە کەسێکی دەوڵەمەندم، بەڵام یەجگار بێنەواو کلۆڵم، نەفرەتو نەفرینێکم بە ملەوەیە کە لەوم شاردووەتەوە، چونکە هێشتا لەوە ئومێدبڕ نەبووم کە رۆژێ لە رۆژان ئەوە ببینم کە لە چنگ ئەو نەفرینە رزگاربم، ئەوەی ژیانی تاڵ کردووم، دەترسم کە ئەو تاقە روناکی، تاقە بەختەوەری، تاقە نیعمەتەی ژیانم، لەگەڵ خۆدا بخەمە چاڵی نەگبەتیو نەمانەوە. ئەوسا دووبارە دەستی بەگریان دەکرد چونکە من بەدبەخت بووم. چەند مێرڤان، چەند دڵو دەروون باش بوو! ئامادە بوو لە هەر ئانو ساتێکدا – جا چەند بە خۆشی!– روحو گیانی خۆی بکات بە قوربانی تاقە فرمێسکێکی من.

وێڕای ئەمەش زۆر دوور بوو کە بتوانێ بە دروستی لە مانای گوتەکانی من بگاتو لێکیان بداتەوە. تەنیا وای تەسەور دەکرد کە من شازادەیەکی لێقەوماوەو گیرۆدەی دوورخستنەوەیەکی دژوار بوومە، وای مەزەندە دەکرد کە من کەسێکی رەهەندەی دەرکراوی بە نێوبانگم،و لە خەیاڵی خۆیدا سیمای قارەمانێتیو گەورەیی بە مەحبوبو دڵدارەکەی خۆی دەبەخشی.

رۆژێ پێمگوت:

*"مینا، لەوەیەکۆتایی مانگی ئایندە،چارەنووسم بگۆڕێتو دیاری بکات، ئەگەر ئەو شتە روو نەدات، جگە لە مردن هیچ رێگەیەکی ترم بۆ نامێنێتەوە، چونکە نامەوێ تۆ بەدبەخت بکەم".*

بەدەم روندك رشتنەوە گوتی:

*"ئەگەر چارەنووست گۆڕاو بەختەوەر بوویت، حەز دەکەم لە بەختەوەریت ئاگاداربمو بەس، دەنا هیچ داواو هەقێکم لە تۆو بەسەر تۆوە نیە. بەڵام ئەگەر بەدبەختو کلۆڵ بوویت، بمکە بە شەریکی بەدبەختیو کلۆڵی خۆت تا لە هەڵگرتنی ئەو بارەدا یارمەتیت بدەم".*

*– کچێ، کچێ، ئەم قسە بە پەلەیە، ئەم قسە گەوجانەیەی کە لە زارت دەرپەڕی، ڕاگرە! ژێوان ببەوە! تۆ لەم بەدبەختیە ئاگاداری؟ بەم نەفرینە دەزانی؟ دەزانی دڵدارەکەت کێیە؟ دەزانی کە...؟ دەبینی کە لە ترساندا دەلەرزم، کە رازو نهێنییەك لە تۆ دەشارمەوە؟*

بەدەم سەڵای گریانەوە خۆی دا بەسەر پێمدا، داواو قسەکەی خۆی دووبارە کردەوە.

سەرپەرشتیاری جەنگەڵوانی هاتە ژوورەوە، گوتم بە نیازم کە لە سەرەتای مانگی ئایندەدا خوازبێنی کیژەکەی بکەم.

ئەوجا لەسەری رۆییشتمو گوتم:

*– بۆیە ئەو ماوەیەم دیاریکردووە چونکە لەوانەیە لە ئەمرۆوە تا ئەو کاتە هەندێ بویەران بێتە پێشێ کە کاریگەریی بەسەر چارەنووسی منەوە هەبێت، بەڵام بە هەرحاڵ هەستم دەرهەق بە کیژەکەی نەگۆڕەو وەکو خۆی ماوە.*

ئەو پیاوە باشە کە گوێی لەو جۆرە قسانەی کۆنت پیتەر بوو، دووچاری ترسو نیگەرانی راستەقینە بوو. بە جۆشو خرۆشەوە لە باوەشی گرتم، ئەوسا بە تەواوی لەم کارە نا شایستەو نا پێویستە تەریق بووەوە. وێڕای ئەمەش لە فکران ڕاچوو، باسی جیازیو رێوشوێنو ئاسوودەیی ئایندەی جگەرگۆشە ئازیزەکەی کرد. سوپاسم کرد کە ئەو مەسەلەیەی وەبیر هێنامەوە،و ئەوسا گوتم چونکە حەزم لێیە لەم دەڤەرەدا، کە وادیارە خۆشیان دەوێم، ئاکنجی

ببمو ژیانێکی ئارامو بێ خەمو پەژارە بەسەر بەرم، تکا دەکەم کە جوانترین مۆڵکی فرۆشیاری ئەم دەڤەرە بە نێوی کیژەکەیەوە بکڕێتو ئاگادارم بکاتەوە تا من پارەکەی بدەم.و گوتم لەم وەزعو حاڵەدا باوکێك دەتوانێ بە باشترین شێوە خزمەتی زاوایەك بکات.

ئەنجامدانی ئەم کارە بۆ ئەو قورس کەوتەوە، چونکە چوو بووە سەر هەر مۆڵکێك بێگانەیەکی لێ قوت بوو بووەوە، بۆیە بە هەزار حاڵ مۆڵکێکی بە نزیکەی یەك ملیون دەست کەوتبوو.

ئەو کارەی کە بە ملی ئەومدا دەدا لە ڕاستیدا حیلەیەکی سپی بوو بۆ دوورخستنەوەی ئەو، پێشتریش لەو جۆرە فێڵانەم بەکار بردبوو، چونکە ئەو پیاوە باشە کەمێك لێمان بوو بوو بە سەربار. دایکی ئازیز، بە پێچەوانەوە، گوێی گران بوو،و وەکو مێردەکەی، تاسەمەندی شانازی قسەکردن دەگەڵ جەنای کۆنت دا نەبوو.

ئەم دایکە ئازیزە هات بەسەردا، ئەم خەڵکە بەختەوەرە گوشاریان بۆ هێنام کە لە بەزمو ئاهەنگەکەی شەوێدا ماوەیەکی زیاتر دەگەڵیان وەمێنم! من یەك دەقیقەش وەختم نەبوو! لەو کاتەدا مانگم دەبینی کە لە ئاسۆوە دەردەکەوتو بەرز دەبووەوە. کاتی من تەواو بوو بوو.

بۆ سبەی شەو، دیسان بۆ باخەکەی سەرپەرشتیاری جەنگەڵوانی هاتمەوە. پاڵتۆیەکەم بە شاندا دابوو و شەپقەکەم هێنابووە سەر تەوێڵم. بەرەو لای مینا رۆییشتم: سەری هەڵبڕی، چاوی بە من کەوت،و لە خۆیەوە جوڵەیەکی کرد. هەنگێ هەستم کرد دووبارە هەمان تاپۆ دەبینم کە لەو شەوە ترسناکەی کە بەبێ سێبەر لەبەر هەیڤە شەوەکەدا دەرکەوتبووم، هاتبووە بەر چاوم، بێگومان هەر ئەوە بوو کە ئەو شەوە دیتبووم: ئاخۆ ئەویش منی ناسی بووەوە؟

مینا ماتو حەپساو ڕاوەستا بوو... تەنگە نەفەس بووبووم. لەسەر کورسییەکەم هەستام، مینا وەکو لاڵ بەدەم گریانەوە لە جێی خۆی وەستا بوو. کەوتمە ڕێ.

لەو کاتەوە زۆربەی کات سەری کردبووە گریان. روحم رۆژ بە رۆژ خەمگینترو پەریشانتر دەبوو. تەنیا دایكو باوکەکە لەوپەڕی خۆشیو شادیدا بوون.

رۆژی دیاریکراو، شوومو پڕ هەڕەشە وەکو هەورێکی پڕ تۆفان نزیك دەبووەوە. دوێنێ شەو بوو.

بە تەواوەتی هەناسەم پێنەدەدرا. هەر بۆ ئیحتیات چەند سەندوقێك سکەو دراوی زێڕم عەمار کردبوو، دانیشتمو چاوەڕوانی سەعات دوانزەم دەکرد. زەنگی سەعات دوانزە لێدرا.

لەسەر جێگاکەم دانیشتبوومو چاوم بڕی بووە میلی سەعاتە دیوارییەکە، دەقیقەو چرکەم وەکو جەزرەبەی خەنجەر دەژمارد. بە کەمترین دەنگ دەکەوتمە لەرزین. بەرەبەرە سپێدە بەیانی دا. سەعاتان یەك لە دوای یەك، بە ئارامییەکی لە رادەبەدەرەوە بورینو تێپەڕین. رۆژو ئێوارێو شەو یەك لە دوای یەك تەواو بوونو بڕانەوە. میلەکان پێشڤەدەچوون، ئومێد دادەمرکایەوە. زەنگی سەعات یازدە لێیدا: هیچ شتێك بەدیار نەکەوت! دوایەمین دەقیقەی دوایەمین سەعات تێپەڕین: هیچ شتێك بە دیار نەکەوت! بوو بە نیوە شەو! یەکەمین زەنگ... دوازدەمین زەنگ لێیدا... و من کە ئومێد بڕ بوو بوومو سێڵاوی روندکم لە چاو دەباران، لەسەر تەختەخەوەکەم پاڵکەوتم. قەرار بوو کە بەیانی ئەو رۆژە خوازبێنی دڵدارەکەم بکەم،و تا رۆژی پەسلان لە

سـێبەرەکەم مـەحروم بـووم! نزیکـی بەرەبـەیان خـەوێکی یـەجگار نـاخۆش‌و پـڕ لـە نیگـەرانیم لێکەوت.

## پەراوێز:

1- *ئاماژەیە بۆ ڕووداوێك لە ژیانی حەزرەتی موسادا (سفری ئەعداد، بابی بیستەم، ئایەتی یازدەیەم).*
2- *مینا، لێرەدا ڕەنگدانەوەی یادی ئەلمینادوشیزییە. ئەدی هەر شامیسۆ نیە کە بە زمانی شلمیل-ەوە لەبەر ئەوەی سەرزەنشتی خۆی دەکات کە زۆر زوو دڵدارەکەی لە بیر کرد، لە کاتێکا ئەلمینا هەمیشە ئەوی لەبیر بووەو لە خەمی ئەودا بووە.*
3- *ئارگۆس، لە ئەفسانانی یۆنان دا، میرو پاشای دوڕگەی ئارگۆسە کە نازناوی پانوپتسی (کەسێك کە هەموو شتێك دەبینێ) دراوەتێ. دێوێکی سەدچاو، کە هەمیشە پەنجا چاوی بە کراوەیی دەما. هیرا، خوابانۆی یونان‌و سێیەمین‌و دوایەمین هاوسەری زیوس، ئەوی کرد بە چاودێری (یو) کامینەی گەنجی خۆی. بەڵام بە ئاوازی نایەکەی هیرمیس خەوی لێکەوت‌و بە دەستی ئەو لە غوڕابی خەودا سەری لە جەستە جیا کرایەوە.*
4- *ئەمە خاڵێکە کە ئەلمینا هەمیشە لە نامەکانیا دەیگوتەوە.*

هێشتا ڕۆژ نەبوو بووەوە، کە لە دەنگی هەراو هەنگامەیەکی توندو تووڕە، کە لە دالأنەکەمدا هەستا بوو، لە خەو ڕابووم. گوێم هەڵخست: بیندل بەر دەرگاکەی گرتبووم‌و نەیدەهێشت بیکەنەوە. ڕاسکال سوێندی خواو پێغەمبەرانی دەخوارد کە مەحاڵە دەستوورو فەرمان لە نۆکەرو خزمەتکارێکی وەکو خۆیەوە وەربگرێت‌و، هەردوو پێی لێکردبووە تاکێ کەوشەوەو دەیویست بێتە ناو تەلارەکەی منەوە. بیندل زۆر بە ڕێزو حورمەتەوە پێی دەگوت کە ئەگەر ئەم قسانە بە گوێی من بگات، دەبێتە مایەی ئەوەی کە کارێکی زۆر باش‌و پڕ ڕزق‌و ڕۆزی لە دەست بدات. ڕاسکال بە هەڕەشەوە پێی دەگوت کە ئەگەر عینادی بکات‌و دەرگا نەکاتەوە لێی دەدات.

جلەکانم بە نیوەچڵی لەبەر کردبوو، بە تووڕەیی دەرگاکەم کردەوەو بەرەو ڕاسکال چووم:

*"چیت گەرەکە، ناکەس بەچەی بێ چاوو ڕوو؟"*

دوو شەقاوێك کشایەوەو بەوپەڕی خوێنساردی بەرسڤی دایەوە:

*"جەنابی کۆنت، بە تەوازوعەوە تکا دەکەم کە سێبەرەکەتم پێ نیشان بدەیت، ڕێکەوتێکی باشە کە هەنووکە هەتاوێکی زۆر جوان داویە لە حەوشە".*

لە تۆ وایە بروسکە لێی دابووم. پاش ماوەیەکی زۆر ئەوسا توانیم بێمە قسە:

**"چۆن بابایەکی نۆکەر دەتوانێ لە هەنبەر ئاغاکەیدا ئەم بێ ئەدەبیە بکات؟"**

بەوپەڕی هێمنی قسەکەی بڕیم:

***"ڕەنگە بابایەکی نۆکەرو خوڵام ئینسانێکی زۆر باش‌و دروستکار بێت‌و نەیەوێت نۆکەریی ئاغایەکی بێ سێبەر بکات، دەمەوێ کە لە خزمەتت مەرەخەس ببم."***

ناچار بامدایەوە:

***"ڕاسکال، ڕاسکالی ئازیز، کێ ئەم بیرە شوومەی خستووەتە کەللەتەوە؟ چۆن باوەڕ دەکەیت؟".***

بە هەمان تۆن‌و شێواز لەسەر قسەکانی ڕۆیی:

***"خەڵکانێك هەن کە دەڵێن گوایە تۆ سێبەرت نیە، وەلحاسڵ، یان دەبێ سێبەرەکەتم نیشان بدەیت یان ڕێگەم بدەی کە لە خزمەتت مەرەخەس ببم."***

بیندل، ڕەنگ زەردو لێوبەبار، بەڵام بە ئامادەگیەکی زەینی زیاتر لە من، ئاماژەیەکی کردمێ‌و منیش پەنام وەبەر تواناو دەسەڵاتی بێ چەندو چوونی زێڕ برد، لێ زێڕیش تواناو دەسەڵاتی خۆی لە دەست دابوو.

ڕاسکال زێڕەکەی فڕێدایە بەردەمم‌و گوتی: ***"من هیچ شتێك لە پیاوی بێ سێبەر وەرناگرم."*** پشتی تێکردم‌و کڵاو لەسەر، بە ئەسپایی‌و بە دەم سۆزەی گۆرانیەوە وەدەرکەوت‌و ڕۆیی. بیندل‌و من کە دەتگوت وشك بووین، لە جێی خۆمان چەقین،حایرو حەپەساو چاومان تێبڕی.

سەرەنجام بە ئاهی قووڵو دڵی خەمینو پەرێشانەوە ئامادەی ئەوە بووم کە لە قسەکەی خۆم ژێوان ببمەوەو وەکو تاوانبارێك لە بەردەم داوەرەکانی خۆمدا، لە باخەکەی سەرپەرشتیاری جەنگەڵوانیدا ئامادە ببم. لە خێوەتێکی ژێر چرە دارێکی سەوزدا کە ناوی منی لێنرا بوو،و قەرار بوو کە خانەوادەکە لەوێدا چاوەڕوانی من بن، دابەزیم. دایکە، دەم بە پێکەنینو بە سیماو روویەکی هێمنو خۆشو گەشەوە بە پیرمەوە هات. مینا، جوانو رەنگ پەڕیو وەکو بەفرێك کە جارجارێ بۆ ماچکردنی دوایین گوڵێن پایز دێت،و دوای تۆزێك دەتوێتەوەو دەبێ بە ئاوێکی تاڵ، بەو ئاوایە دانیشتبوو! سەرپەرشتیار، نووسراوێکی بە دەستەوە بوو،و پەشێوو پەرێشان دەگەڕاو، دەهاتو دەچوو، پەیتا پەیتا ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕاو زەرد دەبوو، هەر چەندە هێمنو ئاسایی بوو، بەڵام وادیار بوو کە گوشارێکی زۆری لە خۆی دەکرد. بۆ لای من هات،و پاش ئەوەی چەندین جار زنجیرەی قسەکانی خۆی بڕی، داوای گفتوگۆیەکی تایبەتی لێکردم. داوای کرد کە بە شەقامێکدا، کە دەچووەوە سەر لایەکی کراوەی باخەکەو هەتاو لێی دەدا، پیاسەیەکی دەگەڵ بکەم.

وەڵامی ئەم داوایەم نەدایەوەو کەوتم بەسەر کورسیەکەمدا،و خامۆشیو بێدەنگییەکی دوورو درێژی ئەوتۆ باڵی بەسەردا کێشاین کە تەنانەت دایکەش زاتی شڵەقاندنی نەکرد.

سەرپەرشتیار، بە شپرزەییو بە هەنگاوی هەڕاو، بە هەشتاو بە باخەکەدا دەهاتو دەچوو. لە ناکاو لە بەردەممدا وەستا، تەمەشایەکی کاغەزەکەی دەستی کردو، ئەوسا نیگاییەکی پڕ پرسیارو تاقیبی منی کردو گوتی:

***" جەنابی کۆنت، ئەرێ راستە کە گوایە پیتەر شلمیل ناوێك ناسیاوتە؟"***

هیچم نەوت.

لەسەری رۆییو گوتی:

***"گوایە ئینسانێکی یەجگار خانەدانو رێكو پێكو باشو پیاوانەیە" .***

چاوەڕوانی وەڵام بوو. گوتم:

***" باشە، ئەگەر ئەو کەسە من بم چی؟"***

بە توندیو تووڕەیی هاواریکرد:

– ***ئەو پیاوەی کە سێبەرەکەی لە دەست داوە!***

مینا هاواری کرد:

***" دڵم خەبەری دابوو، لە دڵم چەقی بوو! دەمێکە دەزانم. سێبەری نیە!"***

خۆی هاویشتە هەمێزی دایکیو دایکی تاین کە زۆر ترسا بوو، بە شپرزەیی بە خۆوەی گوشیو بە توندی کەوتە سەرزەنشتی، چونکە ئەو رازەی لێشاردبوونەوە. وەکو ئارتوز"1" بوو بوو بە سەرچاوەیەکی فرمێسكو بە دەم هاواری گریانی زۆر بە کوڵەوە تێکەڵ بە دەنگی من دەبوو،و بە گوڕوخوڕزم دادەڕژا.

یارۆی جەنگەڵوان کە یەجگار تووڕە بوو بوو، لەسەر قسەکانی رۆییو گوتی:

*"به حاڵەشەوە پڕکێشی ئەوەت کرد کە بە ناوی خۆشەویستییەوە منو ئەویش بخەڵەتێنی، ئەمە خۆشەویستیە کە ئەو هەموو نەگبەتیەت بەسەر هێناوە! تەمەشا چ گریانو شێوەنێکی ناوەتەوە! پەکو! پەنا بە خوا!"*

هێندە پەشێوو پەریشان بووم کە وەکو یەکێك وڕێنە بکات وەڵامم دایەوە. بە مینگە مینگ گوتم سێبەر بە هەموو حیسابێك جگە لە سێبەر چ شتێکی تر نیە،و دەتوانرێ چاوپۆشی لێبکرێ، ئەوە نایەنێ ئەم هەموو هەراو زەنایەی لەسەر بنرێتەوە. بەڵام هێندە بە چاکی هەستم بەبێ بنجو بناوانی ئەو شتانەی کە دەمگوتن، دەکرد، کە خۆ بەخۆ،و بێئەوەی وەڵامێکی قەناعەتبەخش بدەمەوە، بێدەنگ بووم. وێڕای ئەمەش لە ئەنجامدا گوتم ئەوەی کە گوم بووەو لە دەست چووە لەوەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان بدۆزرێتەوەو دەست بخرێتەوە.

بە توندیو تووڕەیی پێی گوتم:

*" جەنابی کۆنت، فایدەی نیە، ئیعتراف بکە،و بڵێ بزانم چۆن سێبەری خۆت لە دەست داوە."*

دیسان ناچار کەوتمە درۆ ڕێسی. گوتم:

*" ڕۆژێ لە ڕۆژان کابرایەکی زلحۆرتی تەژەی ناقۆڵا بەسەریدا ڕۆییو کونێکی گەورەی تێبوو. ئیدی منیش دام بە یەکێك کە بۆمی پینە بکاتو بیدورێتەوە، چونکە زێڕ هەموو موجیزاتێك دروستدەکات. قەولو قەرارمان وابوو کە دوێنێ بۆمی بێننەوە.*

سەرپەرشتیاری جەنگەڵوانی لەسەر قسەکانی ڕۆیی:

*- باشە، جەنابی کۆنت، زۆر چاکە! تۆ خوازگاری کیژەکەی منی، کۆمەڵێکی تریش بە هەمان ئارەزوو و نیازی تۆن. من وەکو باوکێك مەسئولیەتی ئەوم لە ئەستۆیە. مۆڵەتی سێ ڕۆژت دەدەمێ تا سێبەرێك بۆ خۆت پەیدا بکەی. ئەگەر لە ئەمڕۆوە تا سێ ڕۆژی دی بە سێبەرێکەوە، کە دەگەڵ قەدو قەلافاتی تۆدا بگونجێت، هاتیەوە بۆ لام، ئەوا پاو پێڵاوت لەسەر چاو. بەڵام کە بوو بە ڕۆژی چوارەم، ئەوا بە ڕاشکاوی پێت دەڵێم کیژەکەم دەدەم بە پیاوێکی ترو دەبێ بە هاوسەری کەسێکی تر."*

ویستم هەر چۆنێ بێت قسەیەك دەگەڵ مینادا بکەم، بەڵام بەدەم هۆڕژنی گریانەوە خۆی لە هەمێزی دایکی دا شاردەوەو دایکی بە بێدەنگی ئاماژەی کردمێ کە دوور بکەومەوە. بەلارەوە لارەوە وەڕێکەوتم، وام هەستدەکرد کە هەموو دەرگاکانی دنیا لە دوامەوە دادەخرێن.

چونکە لە چنگ چاودێری بینەدل خەلەسیم، بێشەو دەشتو بیابانانم دایە ژێر پێوە. ئارەقەیەکی سارد بە هەنیەمدا دەهاتە خوارێ، ناڵەو زارییەکی کڕو کپو نامەفهوم لە قوڵایی سینەمەوە دەردەهات، شێتایەتی لە بوونمدا دەهاتە کوڵو جۆش.

نازانم چەندێك بوو بەم شێوەیە غارم دەدا، کە لە دەوەنە جاڕێکی پانو بەریندا، کە لە هەتاودا نقوم بوو بوو، هەستم کرد یەکێك قۆڵی کراسەکەی گرتوومو رایدەکێشێت. ئاوڕم دایەوە: کابرای شینپۆش بوو.

هانکە هانکی پێکەوتبوو، پێدەچوو لە مێژ بێ بە دوامەوە بێ. یەکسەر دەستی بە قسان کرد.

***" جوابم ناردبوو، که ئەمڕۆ دێمە دیدەنیت. بەڵام تۆ سەبرو حەوسەڵەی چاوەڕوانیت نەبوو، بەڵام گوێ مەدەیە، هەموو شتێك وەکو خۆی لێدێتەوە، بە دڵی خۆت دەبێ. بە گوێی من بکە. من سێبەرەکەت دەدەمەوەو تۆش هەڵی بگرەوەو یەکسەر بگەڕێوە. سەرپەرشتیاری جەنگەڵوانی لە باخەکەدا بەرێزەوە پێشوازیت دەکات. هەرچیەك روویداوە، تەنیا سوعبەتێك بووەو تەواو. بەڵام سەربارەت بە راسکال کە پەردەی لە رووی رازەکەت هەڵماڵیوەو سەودای خوازبێنی دڵدارەکەتی کەوتووەتە سەر، ئەمەیان لێگەڕێ بۆ من: "ئەو سپڵەی ناکەس بەچەیە هەقی لە سێدارەدانی هەیە."***

وامدەزانی خەو دەبینم... ***"جوابی ناردبوو کە ئەمڕۆ دێتە دیدەنیم؟"*** دووبارە کەوتمە حیساب کردن. هەق بەو بوو. تومەز من لە حیسابکردنەکەی خۆدا یەك رۆژ هەڵەم کردبوو. بە نیازی تاقیبی هەنبانەکە دەستم بۆ بەرۆکم برد. کابرا بە زیرەکی خۆی لە نیازم گەیی و دوو شەقاو کشایەوەو گوتی:

***"نا، جەنابی کۆنت، لە دەستێکی زۆر شایستەدایە، هەڵیگرە."***

بە نیگایەکی حەپساوەوە داوای روونکردنەوەم لێکرد.

لەسەر قسەکانی رۆیی و گوتی:

***"تەنیا شتێکی کەم باییم وەکو یادگار دەوێ و تەواو. تکا دەکەم ئەم نامەیە ئیمزا بفەرموو."***

وەرەقەیەکی چەرمین بوو ئەم وشانەی لە خۆ گرتبوو:

***" من کە خاوەنی ئەم ئیمزایەی خوارەوەم روحی خۆم، دوای جیابوونەوەی ئاسایی لە لەشم بە هەڵگری ئەم وەرەقەیە دەبەخشم."***

لە سەرسامیدا لاڵ بوو بووم، بە نۆرە، جارێ دەمڕوانیە وەرەقەکەو جارێ دەمڕوانیە کابرای نەناس. لەم بەینەدا، بەسەری قەڵەمێك کە تازە دادرابوو، دڵۆپە خوێنێکی، کە زادەی روشانی دڕکێك بوو، لەسەر دەستم هەڵگرت و دایە دەستم.

ئەنجام پێمگوت:

***"تۆ کێیت؟"***

بەرسڤی دایەوە:

***– تۆ هەقت چیە؟ ئەدی بە چاوی خۆت نابینی؟ من بابایەکی دومۆری نەگبەتی بێنەوام، زاناو فیزیکزانێکم کە لە بری ئەو خزمەتانەی بە دۆستەکانمی دەکەم، جگە لە بێ ئەمەکی و سپڵەیی و نمەك حەرامی هیچی تر نابینم، و لەم دنیایەدا جگە لە ئەزموون و تاقیکردنەوە ناچیزەکانم هیچ سەرگەرمیەکی دیکە شك نابەم. کەواتە هانێ ئیمزای بفەرموو، لای ڕاست، لە پاینی وەرەقەکەدا: پیتەر شلمیل".***

سەرێکم لەقاندو گوتم:

***" بمبورە جەناب، ئیمزای ناکەم"***

بەوپەڕی حایرمان و سەرسامی، لەسەر قسەکانی رۆیی و گوتی:

***" ناتەوێ ئیمزای بفەرموویت، بۆچی؟"***

***- مەسەلەی کڕینەوەی سێبەرەکەم بە بارتەقای ڕوحم شتێکە پێویستی بە تێفکرینو ڕامان هەیە!***

گوتی:

***- ئاه! شتێکە پێویستی بە تێفکرینو ڕامانە!"***

قاقایەکی بەرز بەرزی لێدا.

***"نەبێ بە بێ ئەدەبی، پێم ناڵێی ڕوحی تۆ چیە؟... قەت دیتووتە؟ لە دوای مردنت بۆ چیتە؟ دەتەوێ چی پێبکەی؟ کەواتە مەمنونی بەختی خۆت بە کە لە ڕۆژگاری ژیانی خۆتدا، مشتەرییەکت دەستکەوتووە کە لە بری ئەو بەخششە جەبرییە، ئەو وزە کارەباییە یا موگناتیسییە، ئەو شتە هیچە، هەر چیەك هەیە، نرخێکت دەداتێ کە بە ڕاستی نرخە نەك گاڵتە، نرخی سێبەرەکەی تۆیە کە ویساڵی دڵدارەکەتو وەدیهاتنی هەموو ئارەزوو ئاواتەکانتی پێوە بەندە، یان حەزت لێیە بە دەستی خۆت ئەو کیژە بەلەنگازو داماوە ڕادەستی ڕاسکالی خوێڕیو بودەڵە بکەی.... نا، باوەڕناکەم، دەبوایە بە خۆت ئەمەت زانیباو بە چاوی خۆت دیتبات! وەرە، من ئەم کڵاوە بێ لێوارە جادووییەت دەدەمێ (شتێك لە بەڕکی دەردێنێ) تا بەبێ ئەوەی ببینرێین، بڕۆین و لە باخەکەی سەرپەرشتیاری جەنگەڵوانیدا پیاسەیەك بکەین".***

دەبێ دان بەوەدا بنەم کە گوێم لەو کابرایە بوو کە بەو شێوەیە قاقا بە من پێدەکەنی، تەریق بوومەوە. لە ناخی دڵەوە لێی بێزار بووم،و پێموایە کە ئەم نەفرەتو بێزارییە شەخسیەم، هەر چەندە زۆرم پێویست بە سێبەرەکەم هەبوو، زیاتر کردیە کارێك کە ئەو ئیمزایەی بۆ نەکەم کە لە بارتەقای کڕینەوەی سێبەرەکەمدا لێی دەویستم. هەروەها نەمدەتوانی بڕیار لەسەر ئەو پێشنیازەی ئەو بدەم، کە دەگەڵیا بچمە پیاسە، دیتنی ئەم دەڵەچە ناشیرینە،و ئەم جنۆکە ژارخەنە لە نێوان خۆمو دڵدارەکەمدا، لە نێوان دوو دڵی پارچە پارچەو پڕ لە خوێنماندا بێگومان ڕقی هەڵدەستانمو دڵم لێی تێك هەڵدەهات. هەستم کرد رابردوو ناگەڕێتەوەو نەگبەتی بە تەواوەتی شانی گرتووم. ناچار بۆ لای ئەم کابرایە گەڕامەوەو گوتم:

***" جەناب، من سێبەرەکەی خۆمم لە بەرانبەر ئەم هەنبانەیە کە هەر چەندە بە نرخە، بە تۆ فرۆشتو لەم سەودایە زۆر پەشیمانم. ئایا دەتوانین لە ڕای خودا ئەم سەودایە هەڵوەشێنینەوە؟".***

سەری لەقاند،و سیمای شوومی گرژ بوو – لەسەر قسەکانم ڕۆییمو گوتم:

***"زۆر چاکە! من تەنانەت بۆ وەرگرتنەوەی سێبەرەکەشم، ئیدی هیچ شتێکی خۆم بە تۆ نافرۆشم،و هیچ شتێکت بۆ ئیمزا ناکەم. هەڵبەتە بە خۆت دەزانی کە ئەم فێڵو تەڵەکەبازییەی کە پێشنیازی دەفەرمووی ئەوەندەی بە قازانجو مایەی شادمانی تۆیە، ئەوەندە مایەی شادمانی من نیە. جا وەرە داواو پۆزشەکانی من قەبووڵ بکەو چونکە مەسەلەکان گەییوەتە قۆناغێکی ئاوها، با لە یەکدی جیا ببینەوە!***

***- جەنابی شلمیل، بە داخەوەم کە دەبینم لە ڕووی عینادییەوە ئەو مامەڵە یە ڕەفز دەکەیتەوە کە دۆستانە بۆم پێشنیازکردیت، بەڵکو جارێکی تر دەرفەتێکی باشترم بۆ هەڵکەوێ. خودا حافیز!***

***جا ئەگەر ڕێگەم بدەی حەزدەکەم دڵنیات بکەم ئەو شتانەی کە دەیانکرم نایەڵم لە نێو بچن،و زۆر بە بایەخەوە هەڵیاندەگرمو دەیانپارێزم.***

یەکسەر سێبەرەکەمی لە گیرفانی دەرهێناو بە زەبەردەستی بەسەر دەوەنەکانا هەڵیخست و روو لە هەتاو لەبەر پێیدا ڕایخست. پاشان لە نێوان دوو سێبەردا، سێبەرەکەی منو سێبەرەکەی خۆیدا، کە بە دوایەوە بوون، کەوتە ڕێ، چونکە دەبوایە ئەمەشیان(سێبەرەکەی من) بە گوێی ئەو بکاتو گوێڕایەڵو ملکەچی هەموو جمو جۆڵێکی ئەو بێت.

کاتێ کە سێبەرە داماوەکەی خۆم، پاش ئەو دابڕانە دوورو درێژە،و بەو وەزعە ناڵەبارو کەساسیەوە دیتەوە،و لە کاتێکا دابڕانی ئەو منی خستبووە چاڵی ئەو سوکایەتیەوە، دڵم بە حاڵی خۆم سوتاو، گریان ئەوکی گرتمو گریام ئەمما گریان. ڕێك لەو کاتەدا کابرای نەناسی قێزەون، دەسکەوتە سەرکەوتوانەکەی خۆی نواندو بەوپەڕی بێ شەرمیەوە پێشنیازەکەی خۆی دووبارە کردەوە.

***"ئێستاش نەچووە بچێت، دەتوانی وەری بگریتەوە. بە نووکە قەڵەمێك هەموو شتێك بیڕێنیتەوە!ومینای بەدبەخت لە دەست ئەو فێڵبازو ساختەچییە دەربازبکەیت .بە ئاستەمێك نووکی قەڵەمەکە بجوڵێنیت و تەواو، دەی ئافەرین"***

کوڵی گریانم زیاتر جۆشی سەند، بەڵام ڕووم وەرگێڕاو بە ئاماژەیەك داوام کرد کە دوور بکەوێتەوە.

بیندل کە بە دڵی تەژی نیگەرانیەوە تا ئێرە دوام کەوتبوو، لەو ساتەدا هاتە پێشێ. ئەم کوڕە باشە کە بینی دەگریمو فرمێسك دەڕێژم،و سێبەرەکەمی بە دەست کابرای شینپۆشەوە بینی، یەکسەر لێبڕا ئەگەر بە زۆریش بووە سێبەرەکەمی لێ بسەنێتەوە. جا چونکە سەری لەو جۆرە مامەڵە هەستیارە دەرنەدەچوو، یەکسەر روویکردە کابرای نەناس،و بێ هیچ باسو گەنگەشەو درێژدادڕییەك، داوای لێکرد کە بە زووترین کات سێبەرەکەم بداتەوە. کابرای نەناس بێ هیچ جۆرە وەڵامێك پشتی کردە کوڕەی بەلەنگازو دوور کەوتەوە. بەڵام بیندل بە خۆیو داردەستە ئەستوورو گرێ گرێکەیەوە، دوای کەوتو چەند جارێك بە ئاشکراو ڕاستەوخۆ ئەمری پێکرد کە دەستبەرداری سێبەرەکەی من ببێت،و بەدەم هەڕەشەوە، کەوتە نواندنی هێزی بازوو. کابرای نەناس کە دەتگوت خووی بەو جۆرە ڕەفتارەوە گرتبوو، سەری شۆڕکرد، شانی دانەواند، بەکاوەخۆ بە نێو دەوەنەجاڕەکەدا ڕۆییو هەم سێبەرەکەی منو هەم سێبەری خزمەتکارە ئەمەکدارەکەمی ڕفاند. بۆ ماوەیەکی زۆر دەنگێکی نامەفهوم لە چۆڵەوانی دەوەنەجاڕەکەوە هاتە گوێم، پاشان ئەم دەنگە دوور کەوتەوەو نەما. جارێکی دی خۆم لە گەڵ بەدبەختیدا بە تەنیا دیتەوە.

***پەراوێز:***

***1- ئارتوز (Arethuse) ناوی سەرچاوەیەکی بەناوبانگە لە دورگەی ئورتیژی (Ortygie)،و نزیکی سیراکوزە (Sytscuse). بە گوێرەی ئەفسانان ئارتوز کە ئەلفەی***

***خواوەندی رووباران حەزی لێکردبوو و لە ئارکادیدا دوای دەکەوت، لە تاوا پەنای بردە بەر دورگەی ئورتیژی،و ئارتەمیسی خواوەندی هەیڤ، گۆڕی و کردی بە کانیو سەرچاوەیەکی بەناوبانگ.***

لە گۆشەیەکی دەوەنە جاڕەکەدا وێستا بووم، کەوتمە فرمێسك هەڵڕشتن، ئەم فرمێسکانە دڵەی بێچارەمیان، کە لە ژێر باری خەمێکی قورس و کوشندەدا دەینالاند، رزگار کرد. وێڕای ئەمەش هیچ دەلیڤەو مەفەڕو ئاسۆیەکم بۆ رزگاری لە نەگبەتی و داماویە ترسناکەکەم شك نەدەبردو نەدەبینی. بە تورەییەکی شێتانەوە، ئەو ژەهرە تازەیەی، کە کابرای نەناس بە زامەکانیەوە کردبووم، بە تامەزرۆییەوە دەنۆشت. کاتێ کە روحم، وێنەی مینای وەیاد دێنامەوەو سیمای نازداری دڵدارەکەم، بەو شێوەیەی کە دوایەمین جار، لە گەرمەی ریسوایی و شەرمەزاری خۆمدا دیتبووم، رەنگپەڕیوو، چاوانی بە روندکەوە لە بەردەمم دا دەردەکەوتن، تاپۆی لیبۆکانەی راسکال، بێ شەرمانە لە نێوان من و ئەودا سەری قوت دەبووەوە. دەموچاوم لە نێو دەستەکانم دەنا،و بەناو دەوەنەجاڕەکەدا غارم دەدا، بەلام تاپۆ ترسناکەکە دەستبەردارم نەدەبوو،و بەردەوام بە دوامەوە بوو. سەرەنجام، هیلاك و ماندوو، بە هانکە هانك کەوتمە سەر زەوی و بارانی فرمێسکم بەسەر عارديدا داباراند.

هەر هەموو ئەم شتانە لە سۆنگەی سێبەرێکەوە! سێبەرێك کە دەمتوانی بە جووڵەی نووکە قەڵەمێك وەری بگرمەوە! دەکەوتمە لێکدانەوەی ئەو پێشنیازە سەیرەو عینادی و قاییل نەبوونەکەی خۆم. بیرم بە هیچ کوێ ڕانەدەگەیی: نە توانای ڕامانم هەبوو نە توانای بیرکردنەوە. رۆژ ئاوا بوو. بە میوەی کێوی و ئاوی کێوان برسێتی و تینویەتی خۆم دامرکاندەوە. شەوداهات: لە ژێر دارێکدا نووستم. بەڕاستی خەوێکی زۆر ناخۆش بوو، گوێم لە پرخ و هوڕی خۆم بوو، دەتگوت لە گیانەڵلادام، کزەبای ساردی بەرەبەیان لەو خەوە ناخۆشەی بێدار کردمەوە. دیار بوو کە بیندل گومی کردبووم،و من ئەمەم پێ خۆش بوو. چونکە نەمدەویست بگەڕێمەوە ناو بەشەران، وەکو نێچیری هەراسانی کێوی، بە ترسەوە لە بەشەران هەڵدەهاتم. بەمجۆرە سێ دانە رۆژی پڕ لە پەریشانی و نیگەرانی تێپەڕی.

بەیانی رۆژی چوارەم، لە دەشت و بیابانێکی خیزەلانی هەتاوگیردا بووم. لەسەر تاشە بەردێك لەبەر خۆرەتاوەکە دانیشتبووم، چونکە لە مێژ بوو لە بەرەکەتی دیداری هەتاو مەحرووم بووم، زۆرم لەزەت لە دیمەنی دەبینی. کرِوکپ و مات و بێدەنگ، دڵم بە خەم و پەژارەو بێچارەییەکانی خۆی دەسپارد. لە پڕ دەنگێکی سووك ڕایچڵەکاندم. لە کاتێکا کە ئامادەی هەلاتن بووم، چاوێکم بە دەوروبەرمدا گێڕا. هیچ کەسێکم نەبینی. بەلام سێبەرێك کە زۆر لە سێبەرەکەی خۆم دەچوو، لە بەردەمم داو بەسەر خیزەڵلانەکەدا خزی، چونکە بە تەنیا دەڕۆیی، لەوە دەچوو کە دوور لە خاوەنەکەی گوم بووبێ.

دیتنی ئەم سێبەرە، شەوق و زەوقێکی زۆری لەلا بێدار کردمەوە. لەبەر خۆمەوە گوتم:

***"ئەی سێبەر، ئەگەر عەودالی خاوەنیت، من ئامادەم ببمە خاوەنت."***

له جێی خۆم ڕاپەڕیم تا بیگرم. وام مەزەندە دەبرد کە ئەگەر بتوانم دوای بکەوم، بە جۆرێ کە بێتە ژێر پێم، بێگومان پێوەی دەلکێ‌و بە درێژاو بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار، دەتوانێ خوو بە منەوە بگرێت.

کە من ئەو حەرەکەتەم کرد، سێبەرەکە هەڵهات‌و منیش دوای کەوتم. هەڵبەتە ئەم کردەوەیەی من کە بەمەبەستی تاقیب کردنی سێبەرەکە ئەنجامم دا، پێویستی بە قۆچاغی‌و لەش سووکی‌و چالاکی وهێزێکی فرە هەبوو، کە من لەو تاقە ئومێدەوەوە کە بە ڕزگاری خۆمم لەو وەزعە ترسناکە هەبوو، هەڵم دەهێنجا. ڕووی کردە بێشەیەك کە هێشتا دوور بوو، بەڵام بێ چەندوچوون لە نێو چڕە دارستانی بێشەکەدا ونم دەکرد. هەستم بە مەترسی کرد، ترس‌و خۆف نیشتە سەر دڵم،و شەوق‌و خۆزیای ڕزگاری جووتێ باڵی لێڕواندم. هەنگاو بە هەنگاو زیاتر گوڕم دەسەندو بۆ پێشەوە ملم دەنا، سات بە سات لێی نزیکتر دەبوومەوە، زۆر کەمم مابوو بیگەمێ. لە ناکاودا وەستاو ئاوڕی لێدامەوە. وەکو شێرێك کە پەلاماری چەشەو نێچیری خۆی بدات، پڕم دایە تا بیگرم‌و لە پڕ بە قورسی کەوتم بە لەمپەرێکی مەحکەم‌و قایمدا. دەستێکی نادیار بە جۆرێ بەربووە ویژەم‌و پەراسووەکانی کوتامەوە کە ڕەنگە هیچ کەسێك لێدان‌و جەزرەبەی وا خەتەری نەخواردبێ.

ترس وای لێکردم دەستەکانم بەرم‌و ئەو شتە نادیارەی کە لەبەردەمم بوو، توند لە باوەش بگرم. لە جەرگەی ئەو بگرەو بەردەیەدا، درێژاو درێژ کەوتمە سەر عاردی، ئەوسا ئەو پیاوەم، کە دەستەکانم لە قەدی ئالاند بوو،و بە پشتا کەوتبووە ژێرم ، بینی.

هۆی ڕووداوەکەم زۆر بە ئاسایی بۆ ڕوون بووەوە. وا دیار بوو ئەم پیاوە هێلانەی ئەو باڵندەیەی، کە دەبێتە مایەی دیارنەمانی هەڵگرەکەی خۆی، بەڵام نابێتە مایەی دیارنەمانی سێبەری هەڵگرەکەی، دابوو بە عاردیدا "*1*" . ڕوانیمە دەورووبەرم،و خێرا چاوم بە سێبەری هێلانەی ناڤبری کەوت. تەکانێکم داو ئەو دەسکەوتە گرانبەهایەم ڕفاند. کە ئەم هێلانەیەم گرتە دەست، بەتەواوەتی ون بووم‌و لەبەرچاو دیار نەمام، چونکە سێبەرم نەبوو.

پیاوەکە زوو هەستایەوە، یەکسەر چاوی بۆ سەرکەوتووە(فاتح) بەختەوەرەکەی ئەم شەڕە گێڕا، بەڵام لەو دەشتە پان‌و بەرینە هەتاوگیرەدا نە ئەوی بینی‌و نە سێبەرەکەی، کە زۆری مەبەست بوو. ئەلهەقی سەرنجی بێ سێبەریی منی نەدا بوو،و شتی وەهای بە بیردا نەهاتبوو. کاتێ کە دڵنیا بوو کە هیچ شوێن پێیەکی داگیرکەرو دزەکە دیار نیە، تووشی دژوارترین نائومێدی‌و خەم‌و پەژارە بوو و کەوتە قژ ڕنینەوە. بەڵام دەربارەی خۆم پێویستە ئەوە بڵێم کە ئەو گەنجینەیەی کە بە دەستم هێنا بوو، جگە لەوەی دەرفەتی ئەوەی دەرەخساند دووبارە تێکەڵاوی خەڵکی ببم، ئارەزووی ئەو جۆرە کارەشی لەلا وڕووژاندم.

بیانوویەکی زۆرم بە دەستەوە بوو کە پاساوی ئەم دزی‌و تاوانە بۆ خۆم بێنمەوە، بە گوتەیەکی دی پێویستم بە پاساو نەبوو. بۆ ئەوەی لە چنگ هەموو ئەم جۆرە بیرانە ڕزگار بم، بە هەشتاو دوورکەوتمەوە،و ئیدی گوێم بەو کابرا نەگبەتە نەدا کە تا ماوەیەکی زۆر دەنگی

لالانەوەو پاڕانەوەی بە دوامەوە بوو. بەلای کەمەوە هەموو وەزعو حاڵەکانی ئەم بویەرو رووداوە، لەو کاتەدا، بەو جۆرە هاتنە بەرچاوی من.

پـڕ بـەدڵ حـەزم لـەوە بـوو کـە بـۆ باغەکـەی سەرپەرشـتیاری جەنگـەڵوانی بـڕۆمو دەربـارەی هەواڵـەکانی ئـەو کـابرا نەناسـە قێزەونـەی لەمـەڕ خـۆم بکەومـە تاقیـب ، بـەڵام نەمـدەزانی لـە کوێندەرم. سەرکەوتمە سەر نزیکترین گرد،و لەسەر گردەکەوە، باژێڕۆکو باخەکەم بینی. دڵم بە توندی کەوتە لێدان، روندکو فرمێسکان لە چاوانمدا قەتیس مان، ئەم فرمێسکانە زۆر جیاواز بوون لەو فرمێسکانەی کە تا ئەو کاتە هەڵمرشتبوون. ئیدی نزیك بـوو جارێکی دیکە رووی مینا بـدینم!.... بەڕاسـتترین کـوێرە رێگـادا داگـەڕم: شـەوقو تاسـەو خۆزیایـەکی شـپرزە، خێرایـی بـە هەنگاوەکانم دەبەخشی. بـەلای سـێ چـوار دێهاتیـدا، کـە لـە شـارەوە دەهاتنـەوە، تێپـەڕیمو نـەیان دیـتم. باسـی مـنو راسـکالو جەنگەڵوانەکـەیان دەکـرد. نەمدەویسـت گـوێم لـە گفتوگـۆو بـاسو خواسەکەیان ببێ، بۆیە زیاتر پێم هەڵگرت.

بە دڵێك کە پڕ لە هەر دڵە خورپەیەکی چاوەڕوانی بوو، خۆم بە باخەکەدا کرد. وام هەستکرد قاقـای پێکـەنینێك دەژنـەوم، قاقایـەك کـە لـەرزی لێهێنـام. نیگایـەکی خێـرای دەوروبـەرم کـرد، چ کەسێکم نـەبینی. چوومە پێشترەوە. وام هەستکرد دەنگی پێـی کەسێك دێت کە بە تەنیشتمدا دەڕوات، بەڵام کەسم نەبینی: بێگومان، گوێم بە هەڵەی بردبووم. هێشتا بەیانی زوو بوو: باخەکە چـۆڵ بـوو. چ کەسـێك لـە خێمەکـەی کۆنـت پیتـەردا نـەبوو. شـەقامە زۆر ئاشـناکانم تـەی کـرد، تانزیکی ماڵەوە رۆییشتم. هـەمان دەنگ کـە بـەرە بـەرە، ئاشکراتر دەبوو، بە دوومـدا دەهـات. بە دڵێکی ستەمدیدەوە، لەسەر تەختێکی بەرانبەر دەرگاکە، کە لەبەر هەتاوەکە دانرا بوو، دانیشتم. پێدەچـوو کـە جنۆکـە نـا دیارەکـە، بـەدەم ریشـخەنەوە، لەلامـەوە دانیشـتبێت. کلیلێـك لـە قفڵـی دەرگاکەدا سوڕا. دەرگـا کرایـەوە،و سەرپەرشتیار بـە خـۆو کۆمـەڵێك کاغـەزەوە هاتـە دەرەوە. وام مەزەنـدە کـرد کـە تـەمێك بەسـەر سـەرمدا تێپـەڕی، روانیمـە دەوروبـەرم... چ عەجایـەبێ! کـابرای شینپۆش لە تەنیشتمەوە بوو، و بە دەم خەندەیەکی ئەهریمەنیەوە دەیڕوانیـە سـەرو سیمام. ئەو کـڵاوە جادووییـەی، کـە دەیشـاردەوە، لـە بەرانبـەر منـدا ڕاگرتبـوو. سێبەرەکەم هێـدیو هـێمنو ئاسوودەو بێ خەمو خەیاڵ، لە پاڵ سێبەرەکەی ئەودا لەسەر عاردەکە ڕاکشا بوو. بە بێتاقەتیو تەمەڵییـەوە، یـاری بـەو کاغـەزە چـەرمییە دەکـرد کـە بەلامـەوە ئاشـنا بـوو،و لـە کاتێکـا کـابرای سەرپەرشـتیار مـژولی کاغـەزەکانی بـوو، ئـەو بـە پـەنای کەپرەکـەدا دەهـاتو دەچـوو، دۆسـتانە سەری وەپەنای گوێم ناو لە بن لێوانەوە ئەم قسانەی پێگوتم:

"کەواتە ئاقیبەت پێشنیازەکەی منت قەبوڵ کرد، دیارە وەك دەڵێن دڵمان لە ئاستی یـەکتردا پاکە، دڵ ئاوێنەی دڵە! ئەمەش دەسکەوتە، ئەمەش بۆ خۆی دەسکەوتە. بـەڵام هێلانـە باڵندەکەم وێـدەوە، چـونکە ئیتر پێویسـتت پێـی نییـە،و کەسـێکی ئەوەنـدە سـەر ڕاسـتو دروسـتکاریت کـە ناتوانی بە ناهەقو نارەوا داگیری بکەیتو بۆ خۆتی بەریت.وێڕای ئەمەش سوپاسو مـەمنوونی دەربڕی، دڵنیات دەکەمەوە کە لە کانگای دڵەوە ئەوەم پێت داوە."

هێلانه باڵندەکەی، بێ ئەوەی هیچ ناڕەزاییەك بنوێنم، لە دەستم وەرگرتو نایە گیرفانی و ، قاقایەکی بەرزی ئەوتۆی لێدا کە کابرای جەنگەڵوان ئاوڕی دایەوە. منیش ماتو حەیران لە جێی خۆم رەق راوەستا بووم.

لەسەر قسەکانی رۆیی و گوتی:

*"دانە بەوەدا بنە کە ئەم کڵاوە زۆر لە هێلانە باڵندەکەی من باشترو کاریگەرترە، نەك هەر خودی مرۆڤ، بەڵکو سێبەرەکەشی،و هەر سێبەرێکی دیکەش کە مرۆڤ حەزیان لێبکاتو بیەوێ هەبن، دادەپۆشێتو دەشارێتەوە. تەمەشا، ئەمرۆکە دوو سێبەری تازەم هێناوە".*

دووبارە لە قاقای پێکەنینی دا.

*"شلمیل، چاك بزانە کە مرۆڤ ئەو کارەی کە لە هەوەڵەوە نایەوێ بە خوایشتی خۆی ئەنجامی بدات، لە ئەنجامدا بە ناچاری ئەنجامی دەدات. من ئومێدەوارم کە تۆ ئەو شتە بکڕیتەوەو بە دڵدارەکەت بگەی. هێشتا کار لە کار نەترازاوە. بەڵام سەبارەت بە راسکال، دەبێ ئەوە بڵێم کە لە قەنارەی دەدەینو تا پەتێك مابێ ئەم کارە زۆر ئاسانە. جگە لەمەش، باش گوێ بگرە، من سەرباری ئەوەش کڵاوەکەمت دەدەمێ."*

دایکە هات بە سەرداو سەری قسە کرایەوە.

*"مینا چی دەکات؟"*

*– دەگری.*

*– منداڵی نەزان! چونکە هیچ کارێکی تری لە دەست نایەت!...*

*– بێگومان... بەڵام چۆن دەکرێ هەر وا زوو بدرێ بە کەسێکی دی! مێردی ئازیز، تۆ دەرهەق بە جگەر گۆشەکەت زۆر دڵڕەقی!*

*– نە، دایك، تۆ لەم بارەیەوە زۆر هەڵەی. دوای ئەوەی تاوێك گریاو فرمێسکی منداڵانەی هەڵڕشتو سەیری کرد بووە بە ژنی پیاوێکی دەوڵەمەندو بە سەنگو ئیحتوبار، وەکو یەکێك لە خەو بێدار ببێتەوە، ئاسوودەو بێ خەمو خەیاڵ بێدار دەبێتەوەو هیچی لە دڵدا نامێنێ،و هەنگێ بە چاوی خۆت دەیبینی کە مەمنونی خوداو ئێمە دەبێت.*

*– هیوادارم وابێ! خودا لەزارت بنۆڕێ.*

*– مینای ئێمە ئەمڕۆ، بێگومان، سەروەتو سامانێکی مۆڵی هەیە، بەڵام پاش ئەو هەراو فەرتەنەیەی کە چیرۆکی ناکامی پەیوەندی دەگەڵ ئەو ئاژاوەچیەدا، نایەوە، پێتوایە کە دۆزینەوەی خوازگارێکی شایستەی وەکو جەنابی راسکال، بۆ مینا، بەم زووانەو ئەوەندە ئاسان بێ؟ دەزانی داراییەکەی ، خۆی لە چ ژمارەیەك دەدا؟ جەنابی راسکال، بایی شەش ملیۆن مۆڵکی کڕیوە کە هیچ کێشەو بێنەو بەرەیەکی لەسەر نیە،و پارەکەشی کاش داوە. قەواڵەو بەڵگەنامەکان بە من بوو. کاتی خۆی ئەو بوو کە باشترین زەویو مۆڵکی لە موزایەدەدا لە دەست من دەرێنا. جگە لەمەش، نزیکەی بایی سێ ملیۆنو نیو سفتەی لەسەر تۆماس یون هەیە.*

*– کەواتە زۆری دزیوە؟*

***– قسەی بێ سەروبەر دەکەی! لە کاتێکا خەڵکی دەستبڵاویان کردووە، جەنابی راسکال ئاقڵانە پاشەکەوتی کردووە.***

***– ئەو پیاوەی کە جلی نۆکەری لەبەردا بوو؟***

***– قسەی هەلەق و مەلەق مەکە! سێبەرەکەی زەڕەیەك عەیبی نیە.***

***– هەق بە تۆیە، بەڵام وێڕای ئەمەش...***

کابرای شینپۆش چاوی بڕی بووە چاوم. دەرگا کرایەوە. مینا کە خۆی بە بازووی کارەکەرێکەوە گرتبوو، وەژوورکەوت. فرمێسکان، بە بێدەنگی ، تنۆك تنۆك ، بەسەر گۆنا جوانە هەڵبزڕکاوەکانیا دەڕژا. لەسەر کورسییەك، کە لە ژێر زەیزەفۆنانەدا بۆیان ئامادە کردبوو، دانیشت،و بابی لە تەنیشتییەوە رۆنیشت. بە میرەبانی دەستی گرت،و لەو دەمەدا کە فرمێسکی کیژێ ، هێندەی دی زیادی دەکرد، بە شێوازێکی مەحەبەت ئامێزەوە پێی گوت:

***"تۆ جگەرگۆشەی باش و ئازیزی منی، تۆ دەبێ زیرەك و زرینگ بیت و نەیەڵی و نەتەوێ پیرەبابەکەت، کە جگە لە بەختەوەری تۆ هیچی تری ناوێ، غەمگین بکەی..من لە مەسەلەکە تێدەگەم، هەموو ئەم شتانە زۆر نیگەران و پەریشانی کردوویت، لەوە دەچێت کە بە بەرەکەتی پەرجوویەك لە نەگبەتیەکی نزیك رزگارت بوو بێ. بەر لەوەی ئێمەی پەی بە درۆو فەندەڵ فێڵەکانی ئەو ناکەس بەچەیە بەرین، بە دڵ خۆشت دەویست. من ئەمە دەزانم. مینا، لەم رووەوە نەهەقت ناگرم،و گلەییت لێناکەم. منیش، کیژی ئازیزم، تا ئەو رۆژەی کە ئەوم بە کەسێکی دەوڵەمەندو پایەبەرز دەزانی، خۆشم دەویست. بەڵام بە چاوی خۆت دەبینی بارودۆخەکە چۆن گۆڕاوە. هەر توتکە سەگێ بگری سێبەری خۆی هەیە، وا نەبوایە کیژە ئازیزو تاقانەکەی من دەبوو بە ژنی پیاوێك کە... نا، باوەڕ ناکەم.. تۆ ئێستا زەڕەیەك ئەوت لە بیرو خەیاڵدا نیە! گوێ بگرە مینا: پیاوێك کە هیچ ترسێکی لە هەتاو نیە، پیاوێکی دروستکار، کە راستە شازادە نیە، بەڵام بایی دە ملیۆن (دە ئەوەندەی تۆ) سەروەت و سامانی هەیە، پیاوێك کە کیژە ئازیزەکەم بەختەوەر دەکات، داوات دەکات... هیچ وەڵامێکی من مەدەوە، بەرهەڵستی مەکە، کچە ئازیزەکەم، بە گوێی من بکە، رێی بابی خۆت بدە با پارێزگاری بەرژەوەندییەکانی تۆ بکات، رێی بدە با فرمێسکەکانت بسڕێت، بەڵێنم بدەیە کە بە جەنابی راسکال رازی ببی – بڵێ بزانم، ئەم بەڵێنەم دەدەیتێ؟"***

بە دەنگێکی کزو خەمین بەرسڤی دایەوە:

***"من لە ئێستا بە دواوە هیچ ئیرادەیەکم نیە، هیچ ئارەزوویەکم لە دنیادا نیە، با بابم لە جیاتی من بڕیاری چارەنووسم بدات!"***

لەو کاتەدا هەواڵی هاتنی جەنابی راسکال درا، بەوپەڕی بێباکی و بێپەروایی خۆی بە ژوورا کرد. مینا لە هۆش خۆی چوو. هاوڕێ چەپەڵ و نەگریسەکەم نیگایەکی تووڕەی کردم و بەپەلەو لەبن لێوانەوە ئەم قسانەی پێگوتم:

***"ئەم شتانەت پێ قەبووڵ دەکرێ؟ چما لە جیاتی خوێن شتێکی دی بە دەمارەکانتدا دەسووڕێتەوە؟!"***

توند بە دەستیا کێشام‌و بە سووکی برینداری کرد،و خوێنی لێهات،و لەسەر قسەکانی رۆیی‌و گوتی:

*"بەڕاستی خوێنە، خوێنی سوور! ئیمزای بکە!"*

کاغەزە چەرمییەکەو قەڵەمەکەم بەدەستەوە بوو.

## *پەراوێز:*

*1- چیرۆکی ئەو هێلانە باڵندەیەی کە دەبێتە مایەی دیارنەمان،و ون بوون، لە سەدەی هەڤدەیەمدا لەلایەن گریملشاوزن-ەوە نووسراوە. لەگینە شامیسۆ بەرهەمەکانی ئەم نووسەرەی خوێندبێتەوە، کە لە ناو رۆمانتیکەکانی دیکەی وەك ئارنیم‌و برنتانودا زۆر ناسراو بووە.*

شا مسیوی ئازیزم، بیٚ ئەوەی بمەویٚ فریوت بدەم، حەز دەکەم کە لەم بەینەدا بە خۆت داوەرو حەکەم بیت . منی قازیو داوەری سەختگیری خۆم، ماوەیەکی زۆر مۆرانەی پەشیمانیم لە روحی خۆمدا پەروەردە کرد. ئەو دەمە قەیراناوییەی ژیانی خۆم هەمیشە لەبەر چاوم بوو، نەمدەتوانی جگە لە چاوی گومانو شەرمەزاریو پەژیوانی بە هیچ چاوێکی تر تەمەشای بکەم – ***دۆستی ئازیز، کەسێك کە یەکەمین هەڵەو خزین لە ڕێگای ڕاست دەری بکات، زۆر زوو بەناو کوێرە ڕێگاکاندا دەکەویٚو سات بە سات پتر بە هەڵدێری کوێرە ڕێگایاندا دەبرێت، هەنگیٚ بێهودە دەڕوانێتە پرشنگی ئەستێرەی ڕێنوێن، ئیدی هیچ چارو دەسەلاتێکی نابیٚ، دەبیٚ ، بیەویٚو نەیەویٚ هەر بەرەو پایین داگەڕیٚو گیانی خۆی بکات بە قوربانی خواوەندی تۆڵە***– پاش ئەو غەفڵەتو هەڵەیەی کە کردمو ئەو تەوقی نەفرەت و نەحلەتەی چووە گەردنم، ئەشق‌و ڤیان بە جۆریٚ تووشی گوناحو تاوانی کرد بووم کە چارەنووسی کەسێکی دیکەم گرفتاری قەدەرو چارەنووسی خۆم کردبوو. کە تۆوی وێرانیم وەشاندو داوای یارمەتیم لێدەکرا، جگە لەوەی کوێرانەو بەپەلە بۆ ئەو شوێنە بچم کە داوایان لێدەکردم، چیترم لە دەست دەهات؟ دەمتوانی چی بکەم؟ نەمدەتوانی بۆ ساتێکیش دوا بکەوم. جا پێت وا نەبیٚ کە بەرزترین نرخم بە زیاد زانی بیٚو رژدیو رەزیلیم دەرهەق بە شتێکی بیٚ بەها، لە رژدیو رەزیلیم لە بواری زێڕەکانمدا زیاتر بووبیٚ. نا، ئادلبرت، بەلاٚم روحم تەژی ڕقێکی ئەستووری لە دامرکانەوە نەهاتوو بوو دەرهەق بەو کابرا ڕیبابازە زمانلووسە نەناسراوە کەچڕەوە، خوا خوام بوو نەی بینم، بەلاٚم هەر تەماسێك دەگەڵ ئەودا ڕقی هەڵدەستاندم. جارەکی دیکەش بویەرێك روویدا کە چەندین جار لە ژیانما رووی دابوو،و بویەرێك بوو کە بەشێوەیەکی ئاسایی‌و باو لە ژیانی مرۆڤان روو دەدات: رووداوێك کە ملی بۆ دەدریٚ لە جیاتی ئەو کارەی کە دەکرێت. ماوەیەکی دیکەش دەگەڵ خۆدا ئاشت بوومەوە. پێش هەموو شتێك چۆنیەتی ڕێزگرتنی زەرورەت فێر بوومو، چ شتێك پتر لە کارو بویەری ئەنجامدراو پەیوەستە پێوەی؟ پاشان ڕێگەی ڕێزگرتنی هەمان زەرورەت، وەکو خواستێکی فەیلەسوفانە فێر بووم کە سیستەمێکی فراوان دەباتە ڕێوەو، لەو سیستەمەدا وەك چەرخە ددانەدارەکان کە دەکەوینە یەك، کە هێزی بزوێنەر وەردەگریٚو دەیداتەوە. ئەوەی دەبیٚ ببێت، دەبیٚ روو بداتو، نە بیٚ بەشداربوونی ئەو ویستەی (ڤین) کە سەرەنجام ڕێگەی شەرمئامێزێکەییم لە سەرنووشتی خۆمو بە هەمان شێوە لە سەرنووشتی ئەو بوونەوەرانە کە هاوبەشی سەرنوشتی منن، فێر بووم.*

نازانم ئەم کارە بە بەرەنجامو زادەی بێتاقەتی لە ڕادەبەدەری خۆم بزانم یان بە بەرەنجامی داهێزرانو سست بوونی هێزو توانای بەدەنی خۆم، کە بە هۆی بێنەواویی‌و داماوی چەند رۆژی رابردووەوە، تەواو سستو خاو بوو بوو، یان بە زادەو ئەنجامی ئەو توڕە بوونەی بزانم کە بە

هـۆی نزیکبوونـەوەم لـەو دێـوە شینپۆشـە، سـەراپای دادەگـرتم. بـەڵام لـە کـاتی ئیمـزا کردنـی قەواڵەکەدا، بورامەوەو تەختی زەوی بووم، لە تۆ وایە لە مێژە مردووم.

کـاتێ وەخـۆ هاتمـەوە، یەکـەم دەنگـێ کـە بـەر گـوێم کـەوت هەڵپـەرکێ و نـەفرین بـوو. چـاوم کردنـەوە: دنیـا تاریـك بـوو، هاودەمـە قێزەوەرەکـەم، بـەدەم سەرزەنشـت کردنمـەوە، پەرسـتاری دەکردم.

***" ئەم رەفتارە پیرەژنانەیە چیە گرتووتەبەر؟ بجوڵێ، رابە، بێداربەوە، بڕیارەکانی خۆت بە جێ بێنە! یان ژێوان بوویتەتەوەو دەخوازی بگرییت؟"***

وەکـو تـەڕاح درێـژاو درێـژ لە عاردی کەوتبووم، بە هـەزار نـاری عـەلی هەستام، کـڕو بێـدەنگ نۆڕیمە دەوروبەرم. شـەوێکی تـەواو بـوو. لـە ماڵەکەی سەرپەرشـتیاری جەنگەڵوانیـدا کـە سـەراپا چـراخان بـوو، دەنگـی مۆسـیقاو ئاهـەنگ بـوو، ئەوانـەی حـەزیان لـە گەشـت بـوو بـە جـادەو شـەقامەکانی باخەکـەدا دەسـووڕانەوە. دووانیـان بـە دەم گفتوگـۆوە نزیـك بوونـەوە، لەسـەر ئـەو تەختـەی کـە مـن پێشـتر لەسـەری دانیشـتبووم، ڕۆنیشـتن. باسـی زەماوەنـدی جـەنابی راسـکالی زەنگین و دەوڵەمەندیان دەگەڵ کیژی ماڵەکەدا دەکرد، کە بەیانی ئەو رۆژە سەری گرتبـوو. یـانی کار لە کار ترازا بوو!

کڵاوە جادووییەکەی کابرای نەناسم، کە لـەو دەمـەدا لەبەرچاوم ون بـوو، لەسـەرم داکەنـد، بـە نێـو چـڕە دارەکـان کـەوتم و لـە خێوەتەکـەی کۆنـت پیتـەر تێپـەڕیم،و بـە هەشـتاو بـەرەو دەرگـای باخەکـە رۆییشـتم. بـەڵام جەلادەکـەم کـە نـەدەبینرا، دووم کـەوت،و بـە قسـانی پـڕ ئێش و نێشـەوە کەوتە تەشەران:

***" ئەمەیە پاداشتی، ئەو رەنجەی کە بە درێژایی یەك رۆژی تەواو بە دیار میسیۆوە، کە زوعفی ئەعسابی هەیە، کێشام! خۆ بەم حیسابە وا دیارە من لـەم سـەودایەدا کڵاوم چووەتە سـەر! زۆر باشە، جەنابی عینادو سەر سەخت، تۆ بە بێهودە لە من هەڵدێی، چونکە چەند لـە مـن هـەڵێیت و بڕەڤی، هـەر لـە یەکتر جیا نابینـەوە. زێڕەکـەی مـن لـەلای تۆیـە،و سـێبەرەکەی تـۆش لـە دەسـتی مندایە .جا ئەم شتە ئارام لەبەر هەردووکمان دەبڕێ . قـەت بیسـتووتە سـێبەرێك لـە خاوەنەکـەی خۆی دابڕێ! سێبەرەکەی تۆ، من بە دووتـا دێنـێ،و هـەر بـە دووتـەوە دەبم تـا ئـەو رۆژەی کـەرەم دەکەیت و بە لوتف و میرەبانی خۆت وەریدەگریتەوەو منی لە چنگ رزگـار دەکـەیت. ئـەو شـتەی فەرامۆشت کـردووەو بـە خوایشـتی خـۆت ئـەنجامت نـەداوە، رۆژێ دێ بە بێتاقـەتی و ناچـاری و بێزاری ئەنجامی دەدەیت، بەڵام رۆژێ کە ئیدی کار لە کار ترازاوە، زۆر درەنگ بووە. ناتوانی لـە چارەنووسی خۆت دەرباز بیت."***

بە هەمان شێوازو تۆنەوە لەسـەری رۆیـی. بێهودە غـارم دەدا، هەڵدەهاتم، دوام کـەوتبوو و بـە تەوس و توانجەوە دەربـارەی زێـڕو سـێبەر قسـەی دەگـەڵ دەکـردم! مـەحاڵ بـوو بتـوانم هـزرو بیری خۆم کۆ بکەمەوەو بکەومە ڕامان و تێفکرین.

بە کوچەو کۆڵانە چۆڵەکاندا رێگەی ماڵی خۆم گرتبووەبەر. کە گەییمە ئاسـتی ماڵەکـەی خـۆم، بـە حاڵـەحاڵ ناسـیمەوە. هـیچ چـرایەك، روناکیـەك لـە پشـت پەنجـەرە شـکاوەکانەوە نـەدەبینرا.

دەرگاكان داخرا بوون، هیچ نۆكەرو خزمەتكارێك لە ژوورەوە نەدەجولاّو دیار نەبوو. هاوڕێكەم لە قاقای پێكەنینی دا: *"بەڵێ، بەڵێ، وایە... بەلاّم (بیندل)ت لە ژوورەوە دەبینییەوە، چەند ڕۆژێك لەمە پێش لە ڕووی پارێزەوە بۆ ماڵ گەڕێنرایەوە، هێندە شەكەت و ماندوو بوو كە بێگومان لە جێدا كەوتووە."*

دووبارە لە قاقای پێكەنینی دا:

*"زۆر شتت بۆ دەگێڕێتەوە! ئەمڕۆ خوا حافیز،و بە مێڤی دیدار!"*

چەندین جار لە دەركەم دا: چرایەك هەڵبوو. بیندل پرسی كێ لە دەركە دەدات. كاتێ ئەو كوڕە زۆر خاسە دەنگی ناسیمەوە، زۆر بە زەحمەت توانی جڵەوی هەڵچوونی خۆشی و شادومانی خۆی بگرێت. دەرگا یەكسەر كرایەوە، بە دەم گریانەوە باوەشمان بە یەكدا كرد. زۆر گۆڕا بوو، لاوازو نەخۆش بوو، بەلاّم دەربارەی خۆم، پێویستە ئەوە بڵێم كە قژم پاك ماش و برنج بوو بوو. بە نێو ژووره وێرانەكاندا، بۆ هۆڵێكی ناوەوەی بردم كە لە وێرانی ڕزگار بوو بوو. چووە تاقیبی خواردن و خواردنەوەیەك. لەلامەوە دانیشت و دووبارە گریا. بۆی باسكردم كە كابرای لاوازی مردەڵەی شینپۆشی بە سێبەرەكەی منەوە بینی بوو، ماوەو مەودایەكی زۆر دوای كەوتبوو،و سەرەنجام جێ پێی منی بزر كردبوو و لە ماندوویەتی و شەكەتیدا پەكی كەوتبوو. پاشان بۆ ماڵ گەڕابووەوە. زۆری پێ نەچوو بوو، خەڵكێكی زۆر كە ڕاسكال كۆی كردبوونەوە، ڕژابوونە ئەو ناوەو پەنجەرەكانی منیان شكاند بوو و شێتایەتی وێرانكارانەی خۆیان دامركاند بووەوە. ئەو ڕەفتارەیان دەگەڵ وەلی نیعمەتی خۆیاندا كردبوو!

نۆكەرو پێشخزمەتەكانم پەرەوازە بوو بوون، پۆلیسی گەڕەك، بەو بیانووەی كە كەسێكی گومان لێكراوم بڕیاری شار بەدەركردنیان دابووم و مۆڵەتی بیست و چوار سەعاتیان بۆ دانابووم كە لەوێندەر بڕۆم.

جگە لەو شتانەی خۆم دەربارەی سەروەت و سامان و زەماوەندی (ڕاسكال)م دەزانین، (بیندل)ش زۆر شتی دیكەی بۆ باسكردم. تومەز ئەم سپڵەی ناكەس بەچەی ناڕەسەنە، كە سەبەبكاری هەر هەموو ئەو نەگبەتی و بەدبەختیانە بوو كە لێرەدا بەسەر من هاتبوون، لەسەرەتاوە بە نهێنییەكەی منی زانی بوو و تەنیا بە هیوای زێڕ خۆی بە منەوە هەڵواسی بوو. هەر لە سەرەتاوە كلیلی، ئەو گەنجینەیەی كە شوێنی شاردنەوەی سەروەت و سامانەكەم بوو، بەدەست هێنا بوو، بەمجۆرە سەروەت و سامانێكی ئەوتۆی پێكەوە نابوو كە ئەمڕۆكە لە خەمی زیاد كردن و زیاد بوونیا نەبێ.

بیندل، هەر هەموو ئەم شتانەی بەدەم فرمێسك هەڵڕشتنەوە بۆ باسكردم. هەڵبەتە فرمێسكی دیكەشی هەڵڕشت، بەلاّم ئەم فرمێسكانە فرمێسكی شادی بوون، شادی ئەوەی كە جارێكی دیكە بە دیداری من شاد بوو بوو، ئەگەرچی دەمێ بوو، حایرو داخداری ئەوە بوو كە بەدبەختی و نەگبەتی ڕۆژی بەم ڕۆژگارە گەیاندووم، بەلاّم خۆشحاڵ بوو بەوەی كە دەی بینیم هێورو هێدی ملم بۆ چارەنووس داوە. هەڵبەتە هەر ئەو تایبەتمەندیەش بوو كە نائومێدی لە دڵمدا پەیدا كرد بوو. داماوی و بێچارەییم كێو ئاسا سەری بەرز دەكردەوە، ئیدی فرمێسكم نەبوو كە بۆ نەگبەتی

خۆمی بڕێژم، هیچ هاوارێك لە سینەمەوە دەرنەدەهات، خوێنساردو خەمساردو بێ موبالات سەرم لە بەردەم نەگبەتی خۆمدا دادەنەواند.

گوتم:

*"بیندل، تۆ ئاگات لە چارەنووسی من هەیە. لە خۆڕایی نەبووە کە گیرۆدەی ئەم سزا قورسە بووم. ناخوازم کە تۆ ، تۆی پاك و بێگوناح، لەوەی پتر چارەنووسی خۆت، بە چارەنووسی منەوە گرێ بدەیت. دەمەوێ ئەمشەو بڕۆم. ئەسپێکم بۆ زین بکە. دەخوازم بە تەنێ بڕۆم،و خوازیارم کە تۆ بۆ خۆت بمێنیتەوە. وا بزانم هێشتا چەند سەندوقێکی پڕ لە زێڕ لێرە ماوە: بۆ خۆت هەڵیان بگرە. بەڵام من، دەخوازم بە تاقی تەنیا، دنیا بدەمە ژێر پێوە، بەم لاو بەولادا بڕۆم. بەڵام ئەگەر رۆژگارێکی ئارامترم بەخۆوە بینی، ئەگەر بەختەوەری دەگەڵ ژیان و دنیادا ئاشتی کردمەوە، هەنگێ لە رووی ئەمەکدارییەوە یادت دەکەمەوە. چونکە لە هەرەتی ساتە پڕ ئازارەکانی نەگبەتی و رۆژ رەشی دا، لە باوەشی تۆدا گریام."*

ئەو کوڕە باشە، بە دڵی شکاوەوە، ئەم دوا دەستوورو فەرمانەی ئاغاکەی خۆی ئەنجام دا. گوێم بە تکاو پاڕانەوەو هۆشداری و فرمێسکەکانی نەدا. ئەسپێکی بۆ هێنام. جارێکی دیکەش (بیندل)م ، کە هەر دەگریا، لە هەمێز گرت و بە خۆمەوەم نووساند، خۆم هەڵدایە سەر زینەکەو بەو تاریکە شەوە، لە گۆڕی بەختەوەریم دوور کەوتمەوە. لە خەمی رێگاو باندا نەبووم، نیگەرانی ئەوە نەبووم کە ئەسپەکەم بە چ رێگەیەکدا باژۆم، چونکە ئیدی لەم دنیایەدا، لەسەر رووی زەویدیا، هیچ ئامانجێك، هیچ ئارەزوویەك، هیچ هیواو ئومێدێکم نەبوو!

***پەراوێز:***

*1- لە نامەکانی شا میسۆدا لەم جۆرە هزرین و رامانانە دەربارەی خواستی خوایی و چارەنووس و قەدەر، دەبینرێن و هەن.*

دوای ماوەیەکی کەم پیادەیەکم پیێ گەیی، پاش ئەوەی ماوەیەك شان بە شانی من ریێی کرد،و چونکە ریێگامان یەك ریێ بوو، یارمەتی لیێخواستم پاڵتۆکەی بەری دابکەنیێت و بیخاتە تەرکی ئەسپەکەی من. بیێ ئەوەی زار هەڵیێنم، ریێگەی ئەو کارەم پیێدا. بە زمانیێکی شیرین، لەبری ئەو خزمەتە بچووکە، سوپاسی کردم، ستایشی ئەسپەکەی کردم،و لەم ریێگەیەوە دەرگای ستایشی شادمانی و توانای دەوڵەمەندانی کردەوە، نازانم چ جۆرە باسیێکی خۆی دامەزراند کە من لەو بەینەدا جگە لە رۆڵی گویێگریێك هیچ دەوریێکی ترم نەبوو.

بیروباوەڕی خۆی دەربارەی ژیان و دنیا باسکرد، پاشان هاتە سەر باسی میتافیزیکا کە پەیامەکەی، بە بۆچوونی ئەو، دۆزینەوەی کلیلی هەموو مەتەڵ و نهیێنییەکان بوو. بەوپەڕی روونی کەوتە باس و پرسیارو هەر خۆیشی وەڵامی خۆی دەدایەوە .

دۆستی ئازیز، دەزانی دوای بڕینی خویێندنی ریێبازی فەیلەسوفان، بە تەواوەتی بۆم بە دیارکەوت کە فرم بە ئەهلی تیۆریزانیەکانی ئەوانەوە نیە، ئیدی ئەم بوارو کایەیەم بەتەواوەتی لە خۆ قەدەغەکرد. لەو کاتەوە گەلیێکم لەو شتانەی کە فیێریان بوو بووم، تەرك کردو وەلاوەناو بە پشتیوانی ئەقڵی ساغڵەمی خۆم، وەکو خۆت ئامۆژگاریت دەکردم، بە گویێرەی توانای خۆم، کەوتمە پەیڕەوکردنی گازیو بانگەوازیێك کە هەڵبەتە ریێی نیشان دەدام. ویێڕای ئەمەش پیێدەچوو کە ئەم مامۆستای رۆنبیێژییە بە تواناو بەهرەیەکی گەورەوە، کۆمەڵیێك یاساو ریێسای بتەو، بونیاد بنیێت کە زادەو هەڵقوڵاوی خۆیو بە رواڵەت زەرورەتی خۆیەتی. بەلام من ئەو شتەم کە پڕ بە مانای وشە حەزم لیێیدەکرد، تیادا نەدەبینی، لەبەر ئەمە ئیدی ئەم سەفسەتەو دریێژ دادڕییەم ،بەلاوە تەنیا بەرهەمیێکی هونەری سادە بوو، بەرهەمیێك کە بە هەموو جەمال و کەمال و ناسکییەکیەوە جگە لە لەزەتی چاوو بینایی بەکاری هیچی تر نایەت. لەگەڵ ئەمەشدا، بە خۆشحاڵیەوە، بە لەزەتەوە گویێم بۆ گوتەکانی ئەم سوفستائیە بە دەمو زمان و دەماوەرە دەگرت کە هۆشی بردبووم و بەمجۆرە دەردو ئازارەکانی لە یاد برد بووم، ئەگەر توانیبای وەکو چۆن بەسەر زەین و هزرم دا زاڵ بوو بوو، بەو ئاوایە بەسەر روحم دا زاڵ ببیێ، ئامادە بووم لە هەر ئان و ساتیێکدا بە خوایشتی خۆم، خۆمی پیێ بسپیێرم.

کات بوری بوو، نهو سپیێدە ئاسمانی روناك دەکردەوە. کە لە پڕ سەرم هەڵبڕی و پرشنگ و گزنگی ڕەنگانی زۆر جوانم، کە پیێشەنگی هەلاتنی هەتاوە، لە رۆژ هەلاتەوە بینی، کەوتمە لەرزین، لەو دەمانەدا کە سیێبەری تەنان بە هەموو بەرینییەکی خۆیەوە دەپشکویێ، هیچ پەنایەك، هیچ حەساریێك لەو سەر زەمینە بیێ خیێوەدا نەبوو! — و بە تەنیا نەبووم! تەمەشایەکی هاوڕیێکەمم کرد،و دووبارە مووچڕکەم لیێهات : هەمان کابرای شینپۆش بوو!

که بەو سەرسامیەی دیتم کەوتە پێکەنین،و بێئەوەی دەرفەتی قسەکردن بە من بدات، لەسەر قسەکانی رۆیی و گوتی:

**"روخسەت بفەرموو کە تەنیا یەك جار، وەکو داب و نەریتی ئاشنایەتی و موعاشەرەت دەخوازێ، با بەرژەوەندی هاوبەشمان ببێتە مایەی پەیوەندی و یەکێتیمان. هەمیشە کاتی ئەوەمان دەبێت کە لە یەکدی جیا ببینەوە. ئەم جادەیەی کە بە بناری چیادا دەڕوات تاقە جادەو رێگایە کە بە گوێرەی ئەقڵ و لۆژیك بتوانی بیگریتە بەر. ناتوانی بە دۆڵەکەی خوارەوەدا بڕۆیت چ جای ئەوەی بتەوێ دووبارە بە چیادا بگەڕێیتەوە. ئەم رێگەیە رێگەی منە- دەبینم دەگەڵ نزیك بوونەوەی هەڵاتنی رۆژدا رەنگت زەرد هەڵدەگەڕێ . لەم ماوەیەدا کە بەیەکەوە دەبین سێبەرەکەت وێدەدەمەوەو، لەهەنبەر ئەوەدا، دەبێ هاوڕێتیم قەبوڵبکەی. بەتایبەتی کە (بیندل)ت دەگەڵدا نیە. دەتوانم خزمەتی چاکت بکەم. تۆ خۆشت ناوێم، ئەمەم لەبەر گران و ناخۆشە. باشە دەشێت ئەمە ببێتە مایەی ئەوە کە لە خزمەتەکانی من مەحروم ببی؟ شەیتان ئەوەندەش کرێت و دزێو نیە وەکو تەسەور دەکرێت . راستە دوێنێ جاڕزت کردم، بەڵام ئەمڕۆ گلەیی ئەوەت لێناکەم،و دەبێ دان بەوەدا بنەی کە رێگاکەم تا ئێرە بۆ کورت کردویتەوە. دەی باشە، جارێکی دیکەش سێبەرەکەت تاقی بکەوە".**

هەتاو هەڵهاتبوو، خەڵکانێك بە جادەکەدا بەرەو رووی ئێمە دەهاتن، ئەگەرچی لە ناخدا وەڕزو بێزار بووم، بەڵام پێشنیازەکەم قەبوڵکرد. بەدەم پێکەنینەوە سێبەرەکەی هەڵدامە سەر عاردی،و سێبەرکە یەکسەر لەسەر سێبەری ئەسپەکەم ڕۆنیشت و کەیفخۆش و دەم بە پێکەنین شان بە شانم کەوتە یۆرغە .

هەڵچوون و سۆزو گودازێکی سەیر گرتبوومی. بە بەردەم کۆمەڵێك جووتیاری دێهاتیدا تێپەڕیم، کە کڵاویان لەسەر داگرت و وەکو رێزو حورمەت رێگەیان بۆ گەورە پیاوێکی مینا من کردەوە. بەو دەقەوە چوومە پێشێ، لەسەر ئەسپەکەمەوە، بە چاوێکی تامەزرۆو دڵێکی پڕ لە خوێنەوە، ژێراو ژێر دەمڕوانیە ئەو سێبەرەی کە جاران هی من بوو و هەنووکە لە بێگانەیەکم، تۆ بڵێی لە دژمنێکم بە ئەمانەت وەرگرتبوو.

بەڵام سەبارەت بەو، خەمساردو بێ موبالات، بە دوومدا دەهات و لە بن لێوانەوەو بە فیکە فیك گۆرانیەکی دەگوت. ئەو پیادە بوو و من سوارە. سەرەگێژکەم پێکەوت،و وەسوەسەیەکی ئەوتۆم پێکەوت کە خۆم پێنەگیرا، لە ناکاو جڵەوەکەم وەرگێڕا، ئەسپەکەم بەر مامێزان داو بە یۆرغە بە رێگەیەکی قەدبڕدا تێم تەقاند... بەڵام سێبەرەکەم نەبرد، کاتێ کە سەری ئەسپەکەم وەرگێڕا بوو، خزی بوو و کەوتبووە سەر عاردی و لەسەر جادەکە چاوەڕوانی خاوەنی شەرعی خۆی دەکرد. بەوپەڕی شەرمەزاری و تەریقییەوە بە هەمان رێگەدا گەڕامەوە. کاتێ کە کابرای شینپۆش هێدی و هێمن لە گۆرانیەکەی بووەوە، پێم پێکەنی، سێبەرەکەمی لە جێی خۆی دانایەوەو تێی گەیاندم کە تا جارێکی دی نەبێتەوە بە هی من، ناتوانێ پابەندی من ببێت.

لە سەر قسەکانی ڕۆیی و گوتی:

*"به هۆی ئەم سێبەرەوە بە تەواوەتی لە چنگی مندایتو، لە چنگم دەرباز نابیت. پیاوێکی زەنگینو دەوڵەمەندی وەکو تۆ بێگومان پێویستی بە سێبەرە،و تۆ تەنیا یەك هەڵەت هەیە، ئەویش ئەوەیە کە زووتر بەم ڕاستیەت نەزانیوە."*

بە هەمان سەمتدا درێژەم بە سەفەری خۆم دا. دووبارە هەموو نیعمەتەکانی ژیانو تەنانەت شکۆو جەلالیش لە هەمێزیان گرتمەوە.چونکە بوو بووم بە خاوەنی سێبەرێك (هەرچەندە بە ئەمانەت وەرم گرتبوو) دەمتوانی بە ئازادیو بێ خەم ئەم شوێنو ئەو شوێن بکەم. ئەو ڕێزو حورمەتەی کە سەروەتو سامانو دەوڵەمەندی دروستی دەکات، لە هەموو جێیەك بەدەست بێنم. بەڵام دڵم یەجگار تەنگو خەمبار بوو، هاوڕێ سەیرەکەم کە خۆی بە نۆکەرو خزمەتکارێکی نا شایستەی دەوڵەمەندترین پیاوی کۆڕو مەجلیسی ناودارانو ئەشرافان لە قەڵەم دەدا، قەدرزانیو خۆشخزمەتیو فیراسەتو روح سووکیەکی بێ سنووری هەبوو، لە تۆ وایە ڕێك بۆ خزمەتکاری بابایەکی دەوڵەمەند دروست بوو بوو. بەڵام لە من دوور نەدەکەوتەوەو هەموو بەلاغەتو فەساحەتێکی خۆی خستبووە گەڕ کە قەناعەت بە من بکات،و لە پەستاو بێبڕانەوە دەیگوت کە دڵنیایە کە من، ئەگەر بۆ ئەوەش بووبێ کە ئەو لە کوڵ خۆ بکەمەوە، ئەنجام مل دەدەمو بە سەودایەکە قاییل دەبم. چەند بەلامەوە گیانەسەر بوو، ئەوەندەش مایەی نەفرەت بوو، کە چاوم پێدەکەوت ترسێکی راستیم لێدەنیشت. بوو بووم بە کۆیلەی ئەو، لەو رۆژەوە کە هێنا بوومیە سەر شانۆی ئەو دنیایەی کە لێی هەڵدەهاتم، لێی دەرەڤیم، ئاغاو گەورەی من بوو. دەبوایە تەحەمولی زمانە درێژو تەوسامێزەکەی بکەم، هەستم دەکرد هەق بەوە. ئاخر بابایەکی دەوڵەمەند دەبێ لە دنیادا سێبەرێکی بۆ خۆی هەبێتو، هەرکە دەمویست ئەو وەزعە بپارێزم کە دابووی بە کوڵمدا، لە یەك مەفەر زیاترم لە بەردەما نەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا، هەنووکە کە ڤیانو دڵدارەکەی خۆم کردبووە قوربانیو زەوقی ژیانم لە دەست دابوو، مکوڕ بووم لەسەر ئەوەی کە روحم نەك لە بارتەقای سێبەرێك بەڵکو لە بارتەقای هەموو سێبەرانی دنیاش بەم یارۆیە نەدەم. نەمدەزانی کۆتایی ئەم کارە چۆن دەبێت.

رۆژێك لەبەر دەرگای ئەشکەوتێك، دانیشتبووم کە ئەو خەڵکە بیانیانەی کە بە چیادا تێ دەپەڕن، دێنە سەری . لەوێدا دەنگدانەوەی هاڕەو هاژەی سێڵاوی ژێر زەمینی لە قوڵاییەکی بێ بنەوە دێتە گوێو ئەو بەردەی کە تێی فڕێ دەدرێ تا ماوەیەکی زۆر هەر دەنگ دەداتەوەو لەوە ناچێت کە گەیی بێتە بنی ئەشکەوتەکە.

هاوڕێکەم، وەکو خووی هەمیشەیی خۆی، بە زەبری خەیاڵی تیژو جادوویی، پرشنگدارترین وێنەی ئەو شتانەی دێنایە بەر چاومو، لەبەر چاوم بەرجەستە دەکرد کە دەمتوانی دوای کڕینەوەو وەرگرتنەوەی سێبەرەکەم، بە بەرەکەتی هەنبانەکەم ئەنجامی بدەمو بە دەستی بێنم.

هێشتا ئانیشکم دادابوونە سەر ئەژنۆکانمو دەموچاوم لە نێو هەردوو دەستم نابوو، گوێم لە قسەکانی ئەو غەداری بێ ئەمەکە دەگرتو لە نێوان هەوڵی ئەو بۆ لە خشتە بردنمو توانای خۆراگری خۆمدا دوو دڵ بووم . نەمدەتوانی لەوەی پتر خۆم لەبەردەم ئەم کێشماکێشە دەروونییەدا ڕاگرم،و دەستم دایە خەباتی تەواوەتی.

پێمگوت:

***"جەناب، وا دیارە لە بیرت چووە کە ئەگەر ڕێگەم داویت دەگەڵما بمێنیتەوە، ئەم ڕێگە دانە بێ قەیدو مەرج نەبووە و، دەسەڵاتی ڕەهام لە دەستی خۆدا هێشتوەتەوە."***

بەرسڤی دایەوە:

***– ئەمرم پێ بدە با باروبنەم بپێچمەوە."***

ئەم هەڕەشەیە، کاری باوو ئاسایی ئەو بوو. بێدەنگ بووم. ڕێك لەو دەمەدا دەستی بە پێچانەوەی سێبەرەکەم کرد. ڕەنگم تێك چوو، بەڵام نە هیچم گوتو نە پێشمگرت. پاش بێدەنگییەکی زۆر، بەر لەمن کەوتە قسان:

***– مسیۆ، تۆ لە من بێزاری، ڕقت لێمە، بە خۆم ئەمە دەزانم، بەڵام بۆچی لە من بێزاری؟ بڵێی لەبەر ئەوە بێ کە وەکو ڕێگر پەلامارت داموو ویستت هێلانە باڵندەکەم لێبدزیت؟ یان لەبەر ئەوەیە کە لێبڕایت وەکو کەسێکی خاپینۆکی دەستبڕ، ئەو سێبەرەی، کە لە ڕووی ڕاستگۆییەوە بە ئەمانەت دامیتێ، لە چنگم دەربێنی؟ بەڵام من گلەییت لێناکەم، چونکە چاك دەزانم کە تۆ ئامادەیت هەر ڕێگەیەك، هەر فرو فێڵو توندڕەوییەك بگریتە بەر و سەرباری ئەمەش، وای بۆ بچیت کە سەختگیرانەترین پرەنسیپت هەیە،و بە چاوی گەوهەرێکی دروستکارەوە بڕوانیتە خۆت،و ئەم شتانە هەوەسو ئارەزوویەکن کە هیچ ئیعترازێکم لە سەریان نیە. پرەنسیپی من، وەکو پرەنسیپی تۆ توندڕەوانە نیە، بەڵام من بە هەمان شێوە ڕەفتاردەکەم کە تۆ تەسەوری دەکەیت. باشە من بۆ وەدەست هێنانی ڕوحی بەنرخی تۆ کە ئاواتو ئارەزوومە، خودا نەخواستە یەخەم گرتیت؟ باشە خودا نەکەران بۆ وەرگرتنەوەی ئەو هەمبانەیەی کە بە تۆم داوە، یەکێك لە نۆکەرەکانی خۆمم کردووەتە سەرت ؟و خودا نەخواستە لێبڕاوم کە ئەو هەمبانەیە بڕفێنمو هەڵێم؟" .***

هیچ بەرسڤێکم پێ نەبوو، لەسەر قسەکانی ڕۆییو گوتی:

***"زۆر باشە، میسیۆ، با وابێ! تۆ لە من بێزاری، بە زەقی دیارە، بە ئاشکرا هەستی پێدەکەم،و هیچ گلەییەکت لێناکەم. ئاشکرایە کە دەبێ لێکدی جیا ببینەوە، هەڵبەتە تۆش وردە وردە دەبیتە مایەی پەستبوونو دڕدۆنگی من. جا بۆ ئەوەی لە حوزوری نا پەسندی من ڕزگار بیت، جارێکی دیکەش ئامۆژگاریتان دەکەم کە ئەم سێبەرە لە من بکڕیتەوە."***

هەنبانەکەم هێنایە پێشێو گوتم:

***– بەمە ؟***

***– نە!"***

ئاهێکی پڕ ئازارم هەڵکێشاو لەسەر قسەکانم ڕۆییشتمو گوتم:

***"باشە! من مکوڕم جەناب، کە لە یەکدی دوور بکەینەوە، لەوەی پتر، لەم سەر زەمینە بەرینەی کە پێموایە جێی هەردووکمانی لەسەر دەبێتەوە، ڕێگەم لێمەگرە."***

بزەیەکی کردو بەرسڤی دایەوە:

*"مسیۆ، من دەڕۆم، بەڵام بەر لە ڕۆییشتن، دەخوازم فێری ئەوەت بکەم، کە چۆن نۆکەرو خوڵامی زۆر خاکی خۆت، بێنیتەوە خزمەتی خۆت. بەر لە هەموو شتێك هەنبانەکەت تەکان بدەو سکە زێڕەکانی ناوی بێنە زرینگ‌و هوڕ. ئەم دەنگە یەکسەر دەم گێڕێتەوە. هەموو کەسێك لەم دنیایەدا لە خەمی قازانج‌و بەرژەوەندی خۆیدایە، بەڵام وەکو دەبینی من بەرژەوەندی‌و قازانجی تۆش پشتگوێ ناخەم، ئەوەتا ڕێگەی هێزو توانایەکی دیکەشت پێ نیشاندەدەم. ئوه! ئەم هەنبانەیە، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە مۆرانە لە سێبەرەکەی دابیت‌و خواردبێتی، بەڵێ، ئەم هەنبانەیە، ئەو کاتانەش دەتوانێ ببێ بە پردی پەیوەندییەکی بتەو لە نێوانماندا. بە کورتیەکەی بە زێڕەکەی خۆم، جڵەوی منت کەوتووەتە دەست. تەنانەت ئەگەر لە دووری دوورەوەش فەرمایشێکت هەبێ، بەندە، نۆکەرتان دە خزمەتتاندایە. دەزانی کە من دەتوانم خزمەتی فرە بە دۆستانم بکەم‌و، بە تایبەتی دەوڵەمەندان پەیوەندی دۆستایەتیان دەگەڵ مندا هەیە. بە خۆتان ملاحەزەتان فەرمووە، بەڵام دەربارەی سێبەرەکەتان، مسیۆ، پێویستە ئەوە بڵێم کە دەبێ ئەم خاڵەتان لە بیر بێ: تەنیا بە یەك مەرج دەتوانی وەدەستی بێنیتەوە."*

ڕوخسار و سیماکانی ڕابردوو لە ناکاو لە بەردەممدا دەرکەوتنەوە. بە توندی لێم پرسی:

*"ئایا هیچ ئیمزایەکت لە جەنابی یون وەرگرت؟"*

بزەیەکی کرد:

*"لەگەڵ دۆستێکی باشی وەکو ئەودا هەرگیز پێویستم بە ئیمزا نەبوو."*

*– لە کوێیە؟ بۆ خاتری خوا، دەمەوێ بزانم لە کوێیە!"*

بە ئەسپایی دەستی بە بەرکیدا کردو، قژی سەری وێنەیەکی کاڵەوە بووی بێ سەروبەری (تۆماس یون)ی گرت‌و لە گیرفانی دەرهێنا،و لێوە شینەکانی جەستەکە بە زەحمەت کرایەوەو ئەم وشە ترسناکانەی درکاند:

*"بە گوێرەی حوکمی دادپەروەرانەی خودا، بۆ دادگا بانگ کرام، بە گوێرەی حوکمی دادپەروەرانەی خودا، مەحکوم کرام."*

بەترسەوە، هەمبانەکەم بە پەلە فڕێدایە هەڵدێرەکەوەو ڕووم کردە کابرای شینپۆش،و ئەم دوا وشانەم پێگوت:

*"توبی توخودا، لێرە دوور بکەوە، ئەی بوونەوەری مەلعوون، جارێکی دیکە هەرگیز لەبەر چاوم دەرمەکەوە!"*

بە سیمای شوومەوە هەستاو یەکسەر لە پشت ئەو تاوێرو گابەردانەوە کە حەسارێکی لە دەوری ئەم شوێنە ترسناکە چێکرد بوو، ون بوو.

## ((9))

بەمجۆرە خۆم بێ سێبەرو بێ پارە بینییەوە، بەڵام بارێکی یەجگار قورس لەسەر شانم لاچوو بوو! خۆشحاڵ بووم. ئەگەر دڵدارەکەم لە دەست نەدا بوایە، یان ئەگەر لە کاتی لەدەستدانی دا، خۆم بە بێ گوناح زانیبابە، رەنگە بمتوانیبا بەختەوەر بم. وێڕای ئەمەش نەمدەزانی چ بڕیارێك بدەم. گیرفانەکانم گەڕامو چەند سکەیەکی زێڕم دۆزییەوە. ژماردمنو پێکەنیم. ئەسپەکەم لەمیوانخانەکەی بناری کێوەکە بەجێ هێشتبوو. نەموێرا بۆ ئەوێندەر بگەڕێمەوە. بەلای کەمەوە دەبوایە چاوەڕوانی ئاوا بوونی رۆژ بم، هەتاو هێشتا زۆر بەرز بوو. لە سێبەری نزیکترین درەختدا لێی ڕاکشامو ئارامو ئاسوودە خەوتم.

کۆمەڵە وێنەیەکی دڵگیر، لە چوار دەورم، دەستیان خستە ناوقەدی یەكو سەماو هەڵپەرکێیەکی خۆشیان دامەزراند. خەوێکی خۆشم بینی، مینا، تاجە گوڵینەیەکی بەسەرەوە بوو و، بە بەردەممدا رەت بوو زەردەخەنەیەکی دۆستانەی بە ڕوودا دام. (بیندل)ی دروستکارو سەر راستیش کە تاجە گوڵینەیەکی بەسەرەوە بوو، سلاوێکی دۆستانەشی بۆ من نارد. زۆر کەسی ترم بینی، پێموایە، خودی تۆشم ئەی شامسیۆ، لە دووری دوورەوە لە نێو جماعەتدا بینی. دنیا نقومی ڕوناکیەکی یەجگار روناك بوو، دنیا دەبریقایەوە، بەڵام هیچکەسێك سێبەری نەبوو،و لەمەش سەیرتر ئەوە بوو کە ئەم حاڵە زەڕەیەك عەیب یان ناشیرین نەبوو. لە ژێر دارەکاندا جگە لە گوڵو گۆرانیو ڤیانو شادمانی هیچی تر نەبوو... نەمدەتوانی ئەم دیمەنە جوانو رەوتەنیو خێرایانە کە دەمو دەست ئاوا دەبوون، ڕابگرم،و بگرە نەمدەتوانی دەست نیشانیشیان بکەم. بەڵام ئەم خەونە دڵخۆشی دەکردمو ترسی ئەوەم هەبوو کە تەواو ببن. ئەوەی ڕاستی بێ، هەرچەندە لە خەو هەستا بووم، بەڵام بە ئانقەست چاوم دەنوقاندن تا ئەم وێنەو دیمەنە تیژ تێپەڕانە، ئەم شایلۆغانە، تۆزێك زیاتر لە زەینی خۆدا ڕابگرمو بهێڵمەوە.

ئەنجام چاوانم کردنەوە. هەتاو پرشنگی دەدا، بەڵام لە سەمتی رۆژهەڵاتدا بوو. بە درێژایی شەو خەوتبووم. لەمەوە گەییمە ئەو قەناعەتەی کە ئیدی نابێ بۆ میوانخانەکەم بگەڕێمەوە. هەرچیەکم، لەوێ مابوون، بێ هیچ دوو دڵیو کەسەرێك بەجێهێشت،و لێبڕام ئەو کوێرە رێگایەی کە بە بناری کێوەکەدا دەڕۆیی، بە پێیان بگرمە بەر. ئیدی خۆم بە قەدەر سپارد تا چارەنووسم دیاری بکات. کەوتمە ڕێو هەر ئاوڕیشم نەدایەوە، تەنانەت بیرم لەوەش نەکردەوە پەنا وەبەر بیندل ببەم، کە بە دەوڵەمەندی لەوێندەر بە جێم هێشتبوو.

بەو مەبەستەی کە دەمویست دەورو رۆڵێکی تازە بدینم کەوتمە هەڵسەنگاندنی خۆم. جلەکانم زۆر خراپ بوون. جلێکی کۆنەی یەخەو بەرۆك بەشریتو قەیتانی ڕەش چنراو کە پێشتر لە بەرلین لەبەرم کردبوو و نازانم چۆن بۆ ئەم سەفەرە بە دەستمەوە هاتبوو. کڵاوێکی سەفەریم لەسەرو جووتێ پۆتینی کۆنەم لە پێدا بوو. هەستام،و پاش ئەوەی، وەکو یادگار، دار دەستێکی گرێ گرێم بڕی، وەڕێکەوتم.

له لێرەواردا تووشی جووتیارێکی پیر بووم کە بە مێریڤانی سڵاوی لێکردم، دەگەڵیا بە گەرمی قسەمکرد، وەکو ڕێبوارێکی لاپرەسەن، پرسیاری وەزعی ڕێگاوبان، پاشان دەڤەرەکەو خەڵکەکەی، بەروبوومی کوێستان و زۆر شتی دیکەم کرد، بەڕێك و پێکی و زیرەکانە، بە تێرو تەسەلی وەڵامی پرسیارەکانی دامەوە. گەیینە شوێنەواری لافاوێك کە زیانێکی زۆری بە پانتاییەکی بەرینی جەنگەڵەکە گەیاندبوو. بە دیتنی ئەم فەزاو پانتاییە کە هەتاو رووناکی کردبووەوە، لە ناخدا کەوتمە لەرزین. کابرای جووتیارم خستە پێشەوە. بەڵام لە ناوەڕاستی شوێنە ترسناکەکەدا ئاوڕی دایەوە تا چیرۆکی ئەو وێرانی و هەرەسەم بۆ بگێڕێتەوە. زوو بە زوو پەی بەو شتە برد کە نەم بوو،و زنجیرەی ئەو چیرۆکەی کە خەریك بوو دەیگێڕایەوە، بچڕاند:

***"شتی وا هی چۆن دەبێت؟ جەنابت، سێبەرت نیە!"***

لەناخی دڵەوە ئاهێکم هەڵکێشاو بەرسڤم دایەوە:

***– بەداخەوە! بە هۆی نەخۆشیەکی دووروودرێژو ترسناکەوە سێبەرو قژو موو ونینۆکەکانم لە دەست دان. تۆ تەمەشا باوکە، لەم تەمەنەدا ئەو قژەم کە هاتووەتەوەو ڕواوەتەوە پاك سپیە، نینۆکەکانم زۆر کورتن، بەڵام دەربارەی سێبەرەکەم، هێشتا نەهاتووەتەوە.***

***– ئاه! ئاه! هیچ سێبەرێکت نیە، ئەوەی سێبەری نەبێ پولێکی قەڵب نایەنێ! جەنابت، تووشی نەخۆشیەکی فرە خراپ بووی!"***

چیتر لەسەر چیرۆکەکەی نەڕۆیی و کە یەکەمین دووڕیانمان هاتە پێش، بێئەوەی هیچ شتێك بڵێ، لێم جیا بووەوە.

فرمێسکی داخ و کەسەران بە گۆناما هاتە خوارێ و کار لە خۆشی و شادمانیم تێپەڕی.

خەمبارو خەمین ملی ڕێی خۆم گرت و ئیدی منەی کەمترین هاودەمی و هاوڕیاتیم نەکرد. خۆم لە چڕترین گۆشەی لێرەوارەکە ماتەڵ دەکرد،و کاتێ کە پێویست بوایە بە شوێنێکی هەتاوگردا تێ بپەڕم، دەبوایە بە سەعاتان چاوەڕێ بکەم تا کەسێك پەیدا نەبێ و نەمبینێ. هەوڵم دەدا کە شەوێ، لە گوندەکاندا شوێن و ماوایەك پەیدا بکەم. بەو ئومێدەی کە بتوانم کارێك بۆ خۆم پەیدا بکەم، دەچووم بۆ ئەو کانانەی کە لە چیاکاندا بوو. چونکە نەك هەر وەزع و حاڵی ئێستام وای دەخواست کە لە خەمی بژێوی خۆدا بم، بەڵکو زۆر چاك بۆم دەرکەوتبوو کە کاری قورس تاقە دەرمانی ئەو خەیاڵاتانەیە کە وەکو مۆرانە دڵ و گیانی دەخواردم.

سێ چوار ڕۆژ ڕێگە کردن لە کەش و هەوای بارانی دا بووە هۆی ئەوە کە بە پەلە بڕۆم و ڕێیەکی باشم بڕی، بەڵام ئەم ڕێکردنە زۆرە زیانێکی زۆری بە پۆتینەکانم کە هی کۆنت پیتەری سوارە بوو – نەك هی ڕێبوارێکی پیادە– گەیاند. نها پیادە بووم، بە پێیان ڕێم دەکرد، دەبوایە پێڵاوەکانم بگۆڕم. بۆ سبەی بەیانی لە باژێرۆکێکدا کە هەفتە بازاڕیان بوو، زۆر بە جدی کەوتمە تاقیبی پێڵاو. لەبەر دوکانێکدا وەستام کە پۆتینی کۆن و نوێیان دەفرۆشت. ماوەیەکم بە هەڵبژاردن و سەواوە بەسەر برد. جووتێ پۆتینی نوێی زۆر باش بەکارم دەهات، بەڵام هێندە گران بوو، ناچار وازم لێی هێنا. ئیدی لەسەر جووتێ پۆتینی نیوداشت بوو کە هێشتا باش و قایم بوو سازام. کوڕێکی جوانخاسی قژ زەرد کە خاوەنی دوکانەکە بوو، لە جیاتی پارەکەم ئەم پێڵاوەی

دامیٚ‌و بە زەردەخەنەیەکی خۆش‌و دڵگیر سەفەر بە خێری پێگوتم. هەر لەویٚ ئەم پۆتینەم لەپیٚ کردو لە دەروازەی باکوری باژێرۆکەکەوە وەدەرکەوتم. بە جۆریٚ نقومی خەیاڵاتی خۆم بووم کە بە تەواوەتی نەمدەبینی بەرەو کویٚ دەڕۆم. لە خەیاڵی کانەکانی کوێستاندا بووم‌و وا بە تەما بووم کە هەمان شەو بگەمە ئەوێندەر، جگە لەمەش، لە بیروخەیاڵی ئەوەدا بووم کە چۆن‌و بە چ ناوێکەوە لەو کاتانەدا خۆم بناسێنم.

هێشتا دوو سەد شەقاوێك ڕۆییشتبووم‌و نەڕۆییشتبووم سەیرم کرد ڕێگام ون کردووە. سەیرێکی دەوروبەری خۆم کرد، لە لێرەوارێکی چڕە سنۆبەری زۆر کۆن‌و کێوی دا بووم، کە دەتگوت هەرگیز تەوری دارکەرانی لیٚ نزیك نەبوو بووەوە. تۆزیٚ چوومە پێشترەوە. خۆم لە نێو کۆمەڵە تاوێرێکی ڕوتەندا بینییەوە کە جگە لە کرێژە بەردو گیای بەرد شکێن هیچی تری پێوە نەبوو،و لێرەو لەویٚ خاڵ خاڵ بەفرو بەستەڵەکیان تێکەڵاو دەبوو. دنیا فرە سارد بوو. ڕوانیمە پاشمەوە. لێرەوارەکە دیار نەمابوو. چەند هەنگاوێکی دیکەشم نارد. کرێ‌و کپی مەرگ ئاسا دەوری گرتبووم. مەیدانی سەهۆڵبەندانەکە تا چاو بڕی دەکرد هەر درێژ دەبووەوە، چڕە تەمێکی قورسی باڵی بەسەر ئەوێندەرا دەکێشا. هەتاو لە ئاسۆی خوێن ئاساوە دەردەکەوت. سەرماکەی لە کێشا نەبوو. خۆیشم نەمدەزانی چیم بەسەر دەهات‌و دەست‌و پێم لەسەرما چایی بوون، بۆیە ناچار بووم پیٚ هەڵگرم‌و خێراتر بڕۆم. تەنیا هاڕەو هاژەی دوورە دەستی شەپۆلانم دەژنەوت. هەنگاوێکی دیکەم هەڵیناو گەییمە ڕۆخی سەهۆڵبەندانی ئۆقیانووسێك. بە دیتنی من، چەندین ڕەوە بەرازی ئاوی، بە شپرزەیی‌و پەشۆکاوی خۆیان هەڵدایە ئاوەکەوە . کەنارەو کەنار ڕۆییشتم: دیسان گابەردو کەڤری ڕوتەن، دەشت‌و جەنگەڵی غان‌و سنۆبەرم هاتنە پێش. دیسان بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەك بەرەو پێش غارم دا: گەرماکەی لە کێشا نەبوو، هەناسەی سوار دەکرد. ڕوانیمە دەوروبەرم: کەوتبوومە ناو مەرەزەو درەختانی تووەوە. لامدایە بەر سێبەری درەختەکان، سەعاتەکەم لە بەرکم دەرهێنا: هەمووی چارەکە سەعاتێك نەدەبوو کە باژێڕۆکەکەو هەفتە بازاڕەکەیم بەجیٚ هێشتبوو. وامدەزانی خەو دەبینم. بۆوەی بێدار ببمەوە، زمانی خۆم گەست. بەڵام لە ڕاستیدا بەخەبەرم بووم. چاوم نوقاندن تا بیروهزرم کۆ بکەمەوە. هەندیٚ وشەو دەنگی سەیرم، کە بەمینگەمینگ لە زار دەهاتە دەریٚ، بەر گویٚ کەوت. سەرم هەڵبڕی: دوو کەسی چینی بوون، ئەگەرچی بە جلەکانیاندا بە تەواوی نەدەناسرانەوە، بەڵام بە بیچم‌و شێوەی ئاسیایی سەرو سیمایاندا زۆر بە باشی دەناسرانەوە، بە زمانی خۆیان‌و بە گوێرەی دابی باوی وڵاتی خۆیان سڵاویان کرد. دوو هەنگاو کشامەوە: ئیدی نەم دیتنەوە. دیمەنەکە بەتەواوەتی گۆڕا بوو: درەخت‌و بێشەڵان شوێنی مەرەزەکانیان گرتبووەوە. کەوتمە تەمەشاکردن‌و دیقەتدانی ئەم درەخت‌و گیاوگۆڵە پڕ شکۆفانە: بەروبوومی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیام ناسییەوە. ویستم لە یەکێك لەم درەختانە نزیك ببمەوە: هەنگاوێکم هەڵێنا، هەمدیس هەموو شتێك گۆڕا. هەنگیٚ، وەکو تازە سەربازێك کە مەشق دەدریٚ، بە ئەسپایی‌و بە هەنگاوی خاو بەڕێکەوتم. ئەرزو دەشت‌و مێرگوزارو کێوو دەشت‌و بیابانانی خێزەڵان، یەك لە دوای یەك، بە خێراییەکی

پەرجووئاسا، بە بەرچاوانی واق وڕماومەوە بە ریز دەڕۆییشتن. هیچ گومان لەوەدا نەبوو: کە پۆتین‌و پێڵاوی حەوت فەرسەخیم لە پێدا بوو.

به زەبری هەستێکی سۆفیانەی گۆنگ‌و ئاڵۆز چۆکم دادایە سەر عاردی،و فرمێسکی شوکرانە بژێریم هەڵرشت. ئایندەم بە روونی دەهاتە بەرچاوم. من کە لە سۆنگەی یەکەمین خزینەوە لە کۆمەڵگەی مرۆڤان وەدەرنرا بووم، لە جیاتی ئەمە پەنام بۆ باوەشی سروشت، کە هەمیشە بەلامەوە خۆشەویست بوو، دەبرد. زەوی وەکو باخێکی ئاواو ئاوەدانی پڕ بەر لەبەردەمم دا دەکرایەوە. موتالای وزەی بزوێنەری ژیانم‌و زانست دەبوو بە ئامانجی ژیانم.

ئەم بڕیارە بڕیارێك نەبوو کە من دەمدا. لەو زەمانەوە جگە لە کارکردن بە تاسەو ئارەزوویەکی ئارام‌و بەردەوام لە ڕای هاتنەدی موو بە موو و وردی ئەو ئایدیال‌و ئارمانجەی کە لە کەللەی دەدام، دەستم نەدایە هیچ شتێکی ترو رادەی نزیك بوونەوەم لەو ئایدیال‌و ئارمانجە پێوەرو پێوەرو پێوانەی جێگیرو بەردەوامی شادمانی‌و خۆشیم بوو"1".

چونکە تاسەمەند بووم کە بە چاوگێڕانێکی خێرا، مەزرایەك بە موڵکایەتی پەیدا بکەم کە دوای ئەوە دەمویست درۆێنەی بکەم، بە توندی‌و هەڵچوونەوە ڕاپەڕیم. لە بەرزاییەکانی (تبت)دا وەستا بووم،و ئەو هەتاوەی کە یەك دوو سەعاتێك لەوە پێش هەڵاتنیم دیتبوو، لێرە زوو بەرەو ئاوا بوون دەچوو. ئاسیام لە رۆژهەڵاتەوە تا رۆژئاوا دایە ژێر پێوەو هەمووم بڕی ، بەمجۆرە بەدەم ڕێکردنەوە گەییمە ئەفریقیا،و ئەم کیشوەرەم چەندین جار، کونجکاوانە، لە هەموو لایەکەوە تەی کرد. لە میسر سەرقاڵی تەمەشای ئەهرام‌و پەرستگا دێرینەکان بووم کە لە بیاباندا، نزیکی (تیبە)ی سەد دەروازە چاوم بە شکەفتانێك (ئەشکەوت) کە لە رۆژگاری کۆندا ماوای زاهیدانی عیسایی مەزەب بوو. لە ناکاو ئەم بیرەم بە مێشکدا هات: ***"دەبێ ئێرە ببێتە ماڵ‌و ماوای من!"*** یەکێك لە دوورترین شکەفتانم، کە هەم گەورە بوو و هەم مایەی ئاسوودەیی‌و هەم دوور بوو لە دەسڕەسی چەقەڵان، بە ماڵی ئایندەی خۆم هەڵبژارد. پاشان ملی ڕێگام گرتە بەر.

لە ڕێگای ئەستوونەکانی هەرقلەوە"2" خۆم بە کیشوەری ئەورووپادا کرد، پاش ئەوەی سەرێکم بە ویلایەتەکانی باشوورو باکووری ئەورووپادا کێشا، لە ئاسیای باکوورەوە، بە ڕێگای سەهۆڵبەندانی جەمسەرەوە، بۆ گروینلاندو ئەمریکا پەڕیمەوە. دوو بەشی ئەم کیشوەرە گەڕام، لە باشووردا زستان بوو، بۆیە بە پەلە لە کەپکی هۆرن–ەوە بەرەو باکوور رۆییشتم.

بەدەم چاوەڕوانی رووناك بوونەوەی دنیاوە لە ئاسیای رۆژهەڵاتیدا خۆم ماتەڵ کرد. دوای کەمێك پشوودان‌و ئیسراحەت، ملی ڕێگام گرت‌و بڕۆ، لە نێوان هەردوو ئەمریکادا، ڕێگای بەرزترین زنجیرە چیای گۆی زەویم گرتەبەر. بە ئەسپایی‌و پارێزەوە لە لوتکەیەکەوە بۆ لوتکەیەك دەڕۆییشتم، جارێ ڕێم دەکەوتە کێوانی گڕکان‌و جارێ دەکەوتە سەر لوتکانی بەفر گرتوو،و زۆربەی کات هەناسەم سوار دەبوو. سەرکەوتمە سەر کێوی ئیلی،و لە سەرووی دەربەندی برینگ–ەوە بۆ ئاسیا پەڕیمەوە. ئیدی کەناری رۆژهەڵاتی ئەم کیشوەرەم بە هەموو پێچ

پێچەکانیەوە گرتە بەرو بەوپەڕی وردی کەنارەکانی دوورگە نزیکەکانم، کە دەمتوانی بیانگەمێ، دایە بەر زەین.

پۆتینەکانم ، لە نیمچە دوورگەی مالاکاوە بۆ سوماتراو جاوەو مالی و لمبوك-یان بردم. هەوڵم دا تا لە دوورگە بچووك و تاوێرە زۆرو زەبەندەکانی ناو ئەم دەریایەوە، ڕێگایەك لە باکووری رۆژهەڵاتەوە بەرەو بورنیو ودوورگەکانی دیکەی ئەم دوورگەجارە بکەمەوە، کە ئەمە کارێکی زۆر جار نزیکە خەتەر، بەڵام هەمیشە بێهودە بوو. بۆیە پێویست بوو چاو لەم ئومێدە بپۆشم. سەرەنجام، لەسەر بەرزترین کەپکی لمبوك دانیشتم،و رووم بەرەو باشوورو رۆژهەڵات وەرسووڕاند،و وەکو ئەوەی لە زاندانێکدا بم کە دەرگاکەی توند داخرا بێت، کەوتمە فرمێسك هەڵڕشتن، بۆیە گریام چونکە زۆر زوو تووشی کۆسپ و لەمپەرێکی لەبڕین نەهاتوو بوو بووم.

هولاندی تازە، ئەو سەر زەمینە غەریبەی کە بۆ شناسایی زەمین و ناسینی ئەو پۆششەی کە هەتاو بۆی چنیوە، یەجگار زەروریە، ئەرێ، هولاندی تازە لە رووی مندا داخرا بوو، وەکو چۆن کە دەریای باشوور بە دوڕگە مەرجانییەکانیەوە لە رووما داخرا بوو،و لە سەرەتاوە ناچار بووم هەموو کارەکانم بە سادەیی و نیوەچڵی بمێنن. ئەد ئادلبرت- ی ئازیز، ئەدی بەروبووم و ئەنجامی هەوڵ و کۆششی مرۆڤان چیە!

لە هەرەتی سەخت ترین زستانی ئەمریکای باشووردا، لە کەپکی پۆرن-ەوە داگەڕام و گوڕم بەستەوە تا بەڵکو لە ڕێگەی بەستەڵەکی جەمسەرییەوە، ئەو دوو سەد هەنگاوەی کە کەوتبووە بەینی من و سەر زەمینی دیەمن"3"و هولاندی تازەوە ببڕم،و ئەگەر ئەم سەرزەمینە ترسناکەم وەکو بەردی سەر گۆڕەکەم، لە رووداا دابخرێ، تەنانەت نیگەرانی گەڕانەوەش نەبم. جا بەم مەبەستە، بە پڕکێشییەکی بێباکانەوە، ڤیروسیام کردو بەسەر پارچە سەهۆڵانی سەر ئاوەکە کەوتم. هیچ لە سەرماو شەپۆلان نەترسام. هەر هەموو ئەم هەوڵ و کۆشش و بێ باکیانە بێهودە دەرچوو: هێشتا هولاندی تازەم نەدیتووە. ئەوسا هەر جارێك کە بۆ لمبورگ دەگەڕامەوەو لەسەر بەرزترین لوتکەو کەپکی دادەنیشتم و رووم بەرەو باشوورو رۆژهەڵات وەردەگێڕاو، وەکو چۆن لەبەر دەرگا توند داخراوەکەی زیندانەکەمدا گریا بووم، دەگریام.

سەرەنجام لەم شوێنە دوور کەوتمەوە،و بە دڵێکی پڕ لە خەمەوە، بۆ ناو ئاسیا گەڕامەوە. ئەو شوێنانەی ئەم کیشوەرە گەڕام کە هێشتا پێم نەدەزانین و شارەزایان نەبووم، دەگەڵ سپێدەدا بەرەو رۆژاوا وەڕێکەوتم،و هەمان شەو لە سەعیدی میسردا، گەییمە ئەو مەنزڵ و ماوایەی کە دوێنێ دەست نیشانم کردبوو.

هەرکە سووکە ئیسراحەتێکم کردو رۆژ ئەورووپای روناك کردەوە، یەکەم خەمم بوو بەمەی کە هەرچیەکم پێویستە، ئامادەو پەیدای بکەم. بەر لە هەر شتێك کەوتمە بیری شتێك، ئەوزارێك، وەسیلەیەك کە پۆتینەکەم لە حەرەکەت بوەستێنم. ئەوی راستی بێ، بە تەجروبە بۆم دەرکەوتبوو کە لە پێ داکەندنی بە هەر بارێکا کە دەمویست مەوداکە کورت تر بکەمەوە یان بە ئاسوودەیی شتە نزیکەکان تاوتوێ بکەم چەند کێشەو سەریەشەی بەدواوەیە. یەك جووت نەعل کە دەمتوانی لەسەر پۆتینەکانەوە لە پێی بکەم، هەمان ئامانجی پێکا کە پێشبینیم کرد بوو. تەنانەت تا

ماوەیەکیش هەمیشە دوو جووتم لەو نەعلانە دەگەڵ خۆدا دەبرد، چونکە زۆر جار رێك دەکەوت کە جووتێك لەو نەعلانە لەپێم دابکەنم‌و ئیدی دەرفەتی هەڵگرتنەوەیانم نەبێت، بە تایبەتی لەو کاتانەدا کە شێرێ، ئادەمیزادێ، یان کەمتیارێك لە گەرمەی لێکۆڵینەوە ڕوەکناسیەکانم دا هەراسانیان دەکردم. سەعاتەکەی بەرباخەڵم بۆ دیاریکردنی ماوەی کورتی رێکردنەکانمان، زەمان پێویکی زۆر باش بوو. هێشتا پێویستم بە یەك شەش نماو چەند ئەوزارێکی فیزیك‌و چەند کتێبێك هەبوو.

بۆ وەدەستهێنانی ئەم شتانە چەند گەشتێکی نابە دڵم بە لەندەن‌و پاریسدا کرد کە خۆشبەختانە چڕە تەمێکی خۆش دایگرتن‌و تاریکی کردن. کاتێ کە پاشماوەی زێڕە جادوییەکەم دوایی هات، لە جیاتی ئەوە عاجی ئەفریقیاییم هێنا کە پەیدا کردنی ئاسان بوو. بەڵام دەبوایە بچووکترین دانی فیل هەڵبژێرم، ئەو دانانەی کە لە رووی کێشەوە لە توانای خۆم زیاتر نەبێت. زۆری پێنەچوو، هەرچیەکم پێویست بوو پەیدام کردو وەکو زانایەکی ئاماتۆر دەستم بە ژیانی تازەم کرد.

گۆی زەویم لە هەموو لایەکەوە بڕی، هەندێجار بەرزی کێوو چیاکانم دەپێوا، وهەندێ جاری تر گەرمی سەرچاوەو پلەکانی گەرمی‌و ساردی هەوام دەگرت. لێرە دەکەوتمە لێکۆڵینەوەی گیانلەبەران‌و لەوێ هی ڕووەکان. لە خەتی ئیستیواوە بۆ جەمسەر، لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی دی دەڕۆییشتم‌و دەستم دەدایە بەراوردی ئەزموونان بە ئەزموونان. خواردنی باوی من لەسەر هێلکەی وشترمری ئەفریقیاو هێلکەی باڵندانی دەریاکانی باکوور، خورماو مۆزی ناوچە گەرمەسێرەکان بوو.

هەر چەندە شادمانیم نەبووم، بەڵام لە جیاتی ئەوە تووتنم هەبوو، لە جیاتی مەحەبەتی بەشەران، مەحەبەتی سەگێکم هەبوو کە لە سەعیدی میسردا پاسەوانی شکەفتەکەم بوو. کاتێ کە گەنجینە تازەکانم دابوو بە شاناو بۆ ئەوێندەر دەگەڕامەوە، بە هەڵبەزو دابەزو کلکەسووتێ بەرەو پیرم هات، ئەمە بووە مایەی ئەوە کە هەست بکەم لە سەر رووی زەویدا تەنیا نیم.

بویەرو ڕووداوێك جارەکی دی بۆ ناو بەشەرانی هێنامەوە.

***پەراوێز:***

*1- ئەم شتانە دەقاو دەق هەمان ئەو شتانەن کە لەو کاتەوە کە شا مسیۆ خۆی وەقفی تەبیعەتناسی و ڕووەکناسی کرد، لەو ڕوویان دابوو.*

*2- ستونەکانی هەرقل: ناوێکە کە پێشینان لە کەپکەکانی دەروازەی ڕۆژهەڵاتی تەنگەی جەوەڵ تاریقیان ناوە: لەم شوێنەدا کە ئەفسانە بە کۆتایی دوازدە خوانی هەرقلی دەزانێ، گوایە پاڵەوانی ناڤبری دوو ستوونی بۆ یادگاری دروستکردووە.*

3- ئانتون ڤان دیمن (Anton van Diemen) لە ساڵی 1593 لە کولمبورگ لە دایک بووەو لە ساڵی 1645دا لە باتاڤیا (Batavia) مردووە. لە ساڵی 1636ەوە تا ساڵی 1645 حوکمڕانی گشتی هند هوڵاند بووە. لەسەر کارەکانی کون (Coen) ڕۆییشتووە دامو دەزگاکانی پرتگالی لە مالاکاو سیلان داگیر کردووەو بووە بە سەرچاوەی دۆزینەوەی خاکی ڤان دیمن ((یان تاسمانی)).

رۆژێ کە لە دەڤەرێکی باکووردا، لەسەر پۆتینە فەرسەخ پێوەرەکەمەوە، نەعلێکم لە پێ کردبوو و مژوولی کۆکردنەوەی کرێژە بەردو قەوزە بووم، لە ناکاو لە پێچی تاوێرێکدا، سەروسەکوتی ورچێکی سپی لە بەردەممدا قوت بووەوە. ویستم نەعلەکانم دابکەنمو خۆم بگەیەنمە ئەو دورگەیەی کە لە بەرانبەرم بوو،و تاوێرێکی لووسی رووتەن لێی جیادەکردمەوە. بە توندی پێیەکم نایە سەر تاوێرەکە و لەو دیوەوە کەوتمە دەریاکەوە. لە بیرم چوو بوو کە تاکێك لە نەعلەکانم هەر لە پێمدا ماوە.

سەرمایەکی بەترەف گەیی بووە سەر مۆخی ئێسقانم. بە زەحمەتێکی زۆر توانیم لەم مەترسییە بخەلەسم. هەر کە پێم گەییە سەر وشکایی، بە هەشتاو بەرەو بیابانەکانی لیبیا رۆییشتم تا خۆم لەبەر هەتاو هیشك بکەمەوە. بەڵام تیشکی هەتاوەکە هێندە قورس بوو بەسەر سەرمەوە، کە بە تەواوەتی نەخۆش کەوتمو لۆژ لۆژ بەرەو باکوور پەل بوومەوە. هەوڵمدا لە رێگەی وەرزشەوە سوکناییەك بەخۆم ببەخشم، بە هەنگاوی لەرزۆك، بەڵام خێرا، کەوتمە هاتوچۆ لە رۆژاواوە بۆ رۆژ هەڵات ، لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژاوا. جاریٰ خۆم لە روناکیداو جاریٰ لە تاریکی دا، جاریٰ لە زستانداو جاریٰ لە هاویندا دەبینییەوە.

نازانم ئەم هەوڵو تەقەلاو هاتوچۆ شێتانەیە چەندی خایاند. تایەکی گەرمم لێ هاتبوو. شپرزەو نیگەران هەستمکرد ئەقڵم لە دەست دەدەم. لە هەموو ئەمانەش بترازێ، بۆ نەگبەتی لە ماوەی ئەم رێکردنە ئاڵۆزەدا، پێم بە پێی یەکێك دا ناو بێگومان ئازارم پێی گەیاند. کاتێکم بە خۆزانی جەزرەبەیەکم پێکەوتو کەوتمە سەر عاردی.

کاتێ وەخۆ هاتمەوە، سەیرم کرد لە هۆڵێکی گەورەو جواندا، لە نێو زۆر تەختە خەوی دیکەدا، لەسەر تەختەخەوێکی گەرمو نەرمدا راکشا بووم. یەکێك بەدیار سەرمەوە بوو. خەڵکانێك لە نێو هۆڵەکەدا لە تەختەخەوێکەوە بۆ تەختەخەوێکی دی دەرۆییشتن.هاتنە دیار تەختە خەوەکەی منو باسی منیان کرد. منیان بە ((ژمارە دوازدە)) ناو دەبرد. ئەگەرچی لەلای پێیەکانمەوە، لەسەر مێزێکی مەرمەڕی رەش کە لە پاڵ دیوارەکە بوو، بە پیتی زێڕینی درشت بە روونیو رەوانی ئەم ناوەی خوارەوە نووسرا بوو:

***پیتەر شلمیل***

وەهمو خەیاڵ نەبوو، ناوێکی ئاشکرا بوو، بەخۆم دەم خوێندەوە. بەڵام هێندە لاواز بووم کە نەمتوانی کلیلو کۆدی ئەم نووسینانە هەڵبێنمو بدۆزمەوە. دووبارە چاوانم داخستنەوە.

گوێم لێ بوو کە بە دەنگی بەرزو رەوان شتێکیان دەخوێندەوە کە لە میانەیەوە باسی پیتەر شلمیل دەکرێ، بەڵام نەمتوانی لە ماناکەی بگەم، سەیرم کرد پیاوێکی زۆر میهرەبانو

ژنێکی فره جوانی رەشپۆش لەتەختە خەوەکەم نزیك دەبنەوە. روخسار وسیمایانم بەلاوە غەریب و نامۆ نەبوو، بەڵام نەم دەناسینەوە.

ماوەیەك بوری. گوڕو تینم تێگەڕایەوە. *(ژمارە دوازدە)* بە هۆی ردێنە درێژەکەیەوە بە جوو دەژمێردرا. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، پەرستارییەکی فرە دەکرا. پێنەدەچوو هیچ کەسێك لە بیٚ سێبەرییەکەی ئاگادار بێت. دڵنیا کرام کە پۆتینەکە (موزە)م و هەموو ئەو شتانەی دیکە، کە لە کاتی هاتنم بۆ ئەم خەستەخانەیە، لە گیرفانەکانمدا بوون، لە شوێنێکی باش و قایم دانراون تا دوای چاك بوونەوەم پێم بدەنەوە. ئەو شوێنەی کە منی نەخۆش تیایا کەوتبووم (شلمیلیوم)ی پێدەگوترا. ئەوەی هەموو رۆژیٚ گوێم لێدەبوو پاڕانەوە بوو لە خودا کە خێر بێنێتە رێی پیتەر شلمیل، دامەزرێنەری جوامێرو کەرەمکار و خێرەومەندی ئەم دەزگایە (خەستەخانە). تومەز ئەو پیاوە ڕووخۆش و میهرەبانەی کە من بە دیار تەختە خەوەکەمەوە دیتبووم، بیندل بوو، ژنە جوانەکەش مینا بوو"1".

بێئەوەی بناسرێم، لە شلمیلیوم چاك بوومەوە،و بابەتێکی دیکەشم بۆ روون بووەوە ، لە شارێکدا بووم کە زێدو زاگەی بیندل بوو. بە باقی ئەو پارەیەی کە من خێرم لیٚ نەدی بوو، ئەم بیمارستانەی بە ناوی منەوە لەوێندەر دامەزراند بوو،و بە خۆی بەڕێوەی دەبرد، ئەو نەگبەتانەی کە لەویندەر پێشوازی دەکران، درودیان بۆ من دەنارد. مینا بێوەژن بوو. ئەو دادگاییە شوومەی کە بە ناوی دادگای تاوانەوە گیرابوو ، بە قیمەتی گیانی مسیۆ راسکال و بە قیمەتی زۆرترین بەشی سەروەت و سامانەکەی خۆی (مینا) شکا بووەوە. دایکی و باوکی مردبوون. لێرەدا وەکو بێوەژنێکی لە خواترس دەژیاو خەریکی خێرو چاکە بوو لە رای خودادا"2".

رۆژێك لە دیار تەختە خەوەکەی ((ژمارە دوازدەدا) دەگەڵ بیندل دا قسەی دەکرد.

*"خانمەکەم، بۆچی ئەوەندە بۆ ئەم بیمارسانە دێی و خۆت دەدەیتە دەم ئەم هەوا ترسناکەی کە باڵی بەسەر ئێرەدا کێشاوە؟ مەگەر خۆتت لیٚ تەوقە، چارەنووس ئەوەندە دژتە وا ئارەزووی مەرگ دوکوی؟*

*– نا، بیندل گیان، لەو رۆژەوە کە خەونی دوورو درێژم کۆتایی هاتووە، لەو رۆژەوە کە لە خەوی دەروونیم بێدار بوومەتەوە، حاڵم باشە،و ئیدی نە بە ئاواتی مەرگم و نە لە مەرگ دەترسم. بەوپەڕی ئاسوودەی بیر لە رابردوو و ئاینده دەکەمەوە. مەگەر تۆش، بە حوکمی شادییەکی پەنهانی نیە کە ئەم وەفاو ئەمەکە دەرهەق بە ئاغاو دۆستەکەی خۆت دەنوێنی؟.*

*– با، خانمەکەم، سوپاس بۆ خودا، چارەنووسی ئێمە بەڕاستی سەیر بوو، بیٚ هیچ هەڵوەستەو ڕامانێك بادەی شادمانی و دەردو رەنجی تاڵمان لە جامی لێوان لێو خواردەوە، ئەمڕۆ جامەکە بە تاڵە. نها دەشێت وا تەسەور بکریٚ کە هەموو ئەم شتانە تەنیا پرۆڤەیەکی ئازمایشی بووەو بەس...و دوای ئەم تاقیکردنەوە بە سوودە، ئیدی هیچ کارێکمان نیە جگە لەوەی چاوەڕوانی شانۆنامەکە، بەمانای تەواوی شانۆنامە، بکەین.. بەڵام ئەم شانۆنامەیە زۆر جیاوازە، داخ بۆ*

*رابردوو ناخۆین، بەشێوەیەکی گشتی، شادمانین بەوەی کە ژیانمان، بەو شێوەیەی ژیاوین، بەسەر بردووە. من لەو باوەڕەدام کە حاڵی دۆستە دێرینەکەشمان ئەمڕۆ لە ڕابردوو باشتر بێ.*

بێوەژنی خشیك بەرسڤی دایەوە:

*– هەمان رەئی تۆم هەیە."*

و هەردووکیان بە بەردەممدا تێپەڕینو دوور کەوتنەوە. ئەم گفتوگۆیە زۆر کاری تێکردبووم. تیامابووم کە خۆم بناسێنم یان ناوی خۆم نەیەنمو بکەومە ڕێو بڕۆم. سەرەنجام بڕیارم دا. داوای قەڵەمو کاغەزم کرد،و ئەم دێڕانەم نووسی:

*"بەڵێ، حاڵی دۆستە دێرینەکەشتان ئەمڕۆ لەجاران باشترە، ئەگەر باجو کەفارەیەك دەدات، باجو کەفارەی رزگارییە."*

پاشان، کە گوڕو تینێکم تێگەڕا، ویستم جلەکانم لەبەر بکەم. چوون کلیلی ئەو کۆمەدیە بچووکەی تەنیشت تەختە خەوەکەم بێنن. هەموو شتەکانی تێدا بوو. جلەکانم لەبەر کرد، باوڵە چکۆلە روەکناسییەکەم، کە بە خۆشیو شادییەوە قرێژە بەردەکانی باکووری خۆمم تێدا بینییەوە، لەسەر کۆتەکەمەوە کرد بە قەدما. پۆتینەکەم لە پێکرد، نامەکەم لەسەر تەختە خەوەکەم داناو. کە دەرگا کرایەوە، دوور لە شلمیلیوم... لە جادەی سەعیدی میسرا بووم.

کاتێ کە، بە رەخی کەنارەکانی شامدا، رێگایەکم گرتبووە بەر، کە دوایەمین جار، لەو رێگایەوە، لە ماڵی خۆم دوور کەوتبوومەوە، سەیرم کرد سەگەکەم، فیگارۆی وەفادارم، دێتە پێشوازیم"3" لەوە دەچوو کە ئەم سەگە زۆر باشو بە ئەمەکە، پاش چاوەڕوانیەکی زۆری بێهودە، کەوتووبێتە تاقیبو سۆراخی خاوەنەکەی خۆی. وێستامو بانگم کرد. بە قورسکە قورسك بەرەو پیرم هاتو بە هەزارو یەك جۆر شادمانی خۆی بۆ دەربڕیم. ئەو بەستەزمانەم، کە هەڵبەتە نەیدەتوانی لەگەڵ پێی مندا دەربچێتو ڕێ بکات، نایە ژێر باڵم، و بۆ ماڵەکەی خۆمم برد.

هەموو شتێك لەوێندەر بە هەمان دەقی جارانی خۆیەوە مابوو. کە بەرەبەرە دەهاتمەوە سەر خۆو دەبوژامەوە، وردە وروده گەڕامەوە سەر کارە هەمیشەییەکانی خۆمو جۆری ژیانی جارانم. بەڵام تاقە شتێك کە دەبێ بیڵێم ئەوەیە کە ماوەی یەك ساڵ لەسەرمای جەمسەری دوور کەوتمەوە چونکە هەرگیز تەحەمولم نەدەکرد.

شامسیۆ گیان، بەمجۆرە درێژە بە ژیان دەدەم. پۆتینەکەم، وەکو کتێبە زۆر زانایانەکەی تیکیوس (Derebus qestis Pollicilli)"4"لە سەرەتاوە زراوی تۆقاند بووم ، وادەرنەچوو، زەڕەیەك کۆن نابێت. زەڕەیەك لە تایبەتمەندیو خەسڵەتەکانی خۆی لە دەست نادات. تەنیا، هێزو شنگم دەپوکێتەوە. بەڵام بەوە دڵخۆشم کە لە پێناوی ئامانجێکی جێگیردا، سوودمەندانە بە کارم بردووە. پۆتینەکانم بۆ هەر جێیەکیان بردبم، پتر لە هەر کەسێکی پێش خۆم، کەوتوومەتە لێکۆڵینەوەو پەیجۆری زەوی،وشێوەو بەرزاییەکانو ئاوو هەواو گۆڕانکارییەکانی جەوی ئەو زەوییەو دیاردەکانی هێزی موگناتیسی ئەو شوێنەو دیاردەکانی ژیانی ئەوێ بە تایبەتی دەربارەی رووەکان. ئەو مەسەلانەم، بە گوێرەی توانا، بەوپەڕی وردی،و بە شێوەیەکی

سیستەماتیك، لە كتێبانی جۆراوجۆردا شرۆڤە كردووە،و ڕاوبۆچوونو پێشبینییەكانی خۆم لە چەندین وتارو نامیلكەدا تۆمار كردووە. جوگرافیای ناوخۆی ئەفریقیاو ناوخۆی دەڤەرەكانی جەمسەری باكوور،و جوگرافیای ناوخۆی ئاسیاو كەنارەكانی رۆژهەڵاتی ئاسیام نووسیوەتەوە. (مێژووی رووەكانی دوو دنیا)، كە لە دانانی منە، وەكو پارچەیەكی گەورە لە گوڵانی جیهانو وەكو ئەڵقەیەك لە بنەماكانی تەبیعەتو سروشت، زندوو ودیارە. بەمجۆرە پێموایە كە نەك هەر ژمارەی جۆرە ناسراوەكانی رووەكانم بەلای كەمەوە بە ڕادەی سێیەك زیاد كردووە، بەڵكو لە بنەماكانی سروشتو جوگرافیای رووەكانیشدا بەشداریم كردووە. نها بە جددی كار لەسەر (كتێبی گیانلەبەران)ـــەكەی خۆم دەكەم. هەوڵدەدەم كە دەستنووسەكانم، بەر لە مردنم بدرێن بە زانستگەی بەرلین.

جا شامسیۆ گیان، تۆم بە سەر وەسێت و ئەمانەتداری سەربهوردە سەیرو سەمەرەكەی خۆم هەڵبژاردووە، تا كاتیٚ كە لە دنیا رۆییم، ببێت بە دەرسو پەندێك بۆ هەندیٚ خەڵكی سەر رووی زەوی. بەڵام تۆ، دۆستی ئازیز، دەتەویٚ لە نێو خەڵكیدا بژیت؟ جا لەم حاڵەتەدا یەكەم: ڕێگەی ڕێزگرتنی سێبەرو پاشان ڕێزگرتنی پولو پارە فێر بە — دەتەویٚ بۆ خۆتو بۆ باشترین شتێك كە لە تۆدا هەیە بژیت؟ ئۆه، لەم حاڵەدا پێویستت بە ئامۆژگاری نیە.

***پەراوێز:***

*1- ئەم بەشەی كە شلمیل تیایدا لە پەرستاری مینا بەرخوردار دەبێت، ڕووداوێكی هاوشێوە وەیاد دێنێتەوە كە لە (بەسەرهاتی ماگلون)ی بەرهەمی (تیك)دا هەیە، لەو بەشەدا كە ماگلون دەكەوێتە پەرستاری پیردو پرڤانس.*

*2- ئەلمیناش كە بۆ ئاڵمان گەڕابووەوە، خۆی بۆ كاروباری خێرخوازی تەرخان كردبوو،و ئامادەیی خۆی بۆ پەرستاری زامدارانی واتەرلو ڕاگەیاند بوو. ئەو شیعرانەی كە بڵاوی كردنەوە، وەكو هەزرینو ڕامانی مینا، بیرۆكەی بەردەوامی مەرگیان لە توێی خۆدا هەڵگرتووە.*

*3- شامیسۆ، لە سەردەمی جەنگی 1806دا سەگێكی هەبوو بە نێوی فیگارۆ.*

*4- كارو رەفتاری پتی پوسە (Petit Poucet)، چیرۆكێكی درامییە لە سیٚ پەردەدا، لە نووسینی (تیك)ـەو لە ساڵی 1811دا بڵاوبووەتەوە. نووسەر لە میانەی ئەم چیرۆكە درامیەوە باسی ئەو پۆتینە تایبەتیە دەكات كە چۆن لەگەڵ لێنانی هەر بنو پینەیەكی تازەدا بوردەكەی كەم دەبێتەوە.*

***تێبینی:***

***رۆژی چوار شەممە 2011/11/30، سەعات نۆو نیوی دانی بەیانی لە وەرگێڕانی ئەم رۆمانە بوومەوە. کە لەم سەرچاوەیەوە پاچڤە کراوە:***

***مردی کە سایەش را فروخت***

***یا سرگذشت شگفت پیتەر شلمیل***

***ادلبرت فن شامسیۆ***

***ترجمە: عبداللە توکل. چاپ اول 1376 نشر مرکز.***

## فەرهەنگۆك

ئاپۆڕە: كۆمای خەڵك پێكەوە، حەشامات، قەرەباڵغی

ئەمەك: وەفا، ئەمەگ

ئەوزار: ئامێر، وەسیلە

ئەوك: گەروو، بەرمل، قوڕقوڕاچگە

ئیكلام: كڕنۆش، سەرچەماندن بۆ رێزگرتن

بارتەقا: هەنبەر، بەرانبەر،باتەقا

باژێڕۆك: شارۆچكە

باژۆم: لێخوڕم

بخەلەسم: خەلاس بم، رزگاربم

بەترەف:خراپ، بەتلاو

بەردەبار:زاناو بەتەگبیر

بەرسڤ:وەرام، وەلأم

بەلەنگاز:بەستە زمان، نەدار، بێچارە

بەلەز: پەلە

بەكاوەخۆ:هێدی، یەواش ،لەسەرخۆ، بەسەبر

بەكڕی: بەكپی، بە بێدەنگی

بوری: رابرد، تێپەڕی

بەهەشتاو: بە پەلە، بەلەز

بە هیچ كلۆجیٚ: بە هیچ شێوەیەك

بویەر: ڕووداو

بیچم: شكلٚ و هەندام، تەرح و دیدار، تەرزو شێوە

بیٚ خێو: بیٚ خاوەن، بیٚ خودان

بێنەوا:هەژار، بیٚ ئەنوا

پڕم دایە: پەلامارم دایە

پەڕەوازە: ئاوارە، تەرە

پەنهان: نادیار، شاراوە

پێشكار: خزمەتكار، سەرۆكی پێشخزمەتان

تاین: ناوبراو، یارۆ، فلأن

تەڕاح: حەمالٚ،

تەڕدەست: چاپك، لێزان، دەسڕەنگین

تەژە: درێژی ناقۆلا

تەشەر: تانە، قسەی بە توێکڵ

تەرك: تەرخ، بەشی دواوەی زین

تەڵفیزی: حەنەك، گەپجاڕی

تەوێڵ: هەنیە، ناوچەوان، نێوچەوان

جڤات:کۆبوونەوە، کۆم بوون

جوانخاس: پیاوی زۆر جوان و ڕێك وپێك

چراخان: چرا هەڵکردن بۆ شادی

چاییبوون: ڕچیبوون، سەرمابوون

چرمسیوە: ژاکاوە، سیس بووە

چەشە: چەژە، تام

چێکردبوو: دروستکردبوو

حایر: سەرسام

خاپینۆك: فریبۆك، خەڵەتێنەر

خاس: باش

خشیك: خشکۆك، خشتیلە، ڕند

خاکەساری: بێچارەیی، هەژاری، بەلەنگازی ، داماوی

خوازگار:داواکەر، خوازبێنیکەر

خودا لە زارت بنۆڕێ: هانا بەدەمت

خورزم: تەوژم، ڕێژنە ، تاوی توندی باران

خوێنسارد: بە حەوسەڵە، هێدی ، هێمن

خیزەڵان: شوێنێ کە زیخ و چەوی زۆر بێت

خێومردە: خاوەن مردگ

دەڕەڤیم: دەڕەویمەوە، هەڵدەهاتم

درێو: ناحەز، ناشیرین

دژەبا: بایەك کە مرۆڤ نەیەوێ

دەماوەر: قسە زان، وتەپاراو، هەڵەوەڕ

دەژنەوم: دەبیستم

دەڤەر: ئاقار، شوێن، جێ، ناوچە

دەوڵەت: سەروەت، دارایی، مەڕ و ماڵات

دڕدۆنگ: دوودڵ، بە گومان

دوڕگەجاڕ: شوێنی دوڕگەی زۆر

دڵنەواز: دڵنەوا، شتێ دڵخۆش بکات

دەلیڤە: دەرفەت، هەل،

دوئاتەشە: تۆخ

دومۆر: قەرەبەخت، شووم، چارەڕەش، نەحس، بێبەخت

دەڵەچە: ڕوبین، ڕیاباز

ڕاجفری:ڕاچڵەکی ڕاچەنی، ڕاجلفین

ڕازگر: سرقایم، کەسێك نهێنیت دەپارێزێت

ڕۆژی پەسلان: ڕۆژی حەشر، ڕۆژی قیامەت

ڕاسپارنامە: نامەی ڕاسپێری

ڕوندك: فرمێسك، ئەسرین، عەسر

ڕۆنیشت: دانیشت

ڕەخ: کەنار ، لێوار، قەراخ

ڕەهەندە: ئاوارە، دەربەدەر، سەرگەردان

ڕیشخەن: گاڵتە پێکردن، پیٰ پێکەنین

زات: جورئەت، غیرەت، وێران، نەترسان

زاری: گریە

زاگە: شوێنی لە دایکبوون، زێد

زلحۆرت: تەژەی ناقۆڵاٚ

زەبەردەست: کارامە، کارزان، خورت، بەهێز وتوان

زێڕچن:بە زێڕ چنراو

ژارخەن: پێکەنینی ژاراوی

ژارۆ: فەقیر، هەژار، نەدار

سارە شەو:سبەی شەو

ساڵمەند:بەتەمەن، پیر

سەختگیر: رەق، توند، پێداگر

سەروەسێت:سەرەوگرد

سەمت:لا، ئالی، رەخ، نکال

سۆز وگوداز:هەڵچوون، ئینفیعال

سۆنگە:هۆ، لەبەر، بەهۆی

سێڵاٚو:لافاو، لەهی

سیاناو:قوڕاو

شکەفت:ئەشکەوت

شنگ:زۆر، هێز ، تاقەت

شێروانی: جەمەلۆن ئاسا

**غان: جۆرە درەختێکە**

**فەندەڵ فێڵاَن:فڕو فێڵ ، هەنجەت و بیانووان**

**قۆچاغ:خۆشڕۆ ، خێرا لە ڕێکردندا**

**کارەکەر: خزمەتکار (بۆ ئافرەت)، قەرەواش، جێری**

**کەپك: لووتە، قووتەی شاخ**

**کرێت:ناشیرین، کاری پیس و خراپ**

**کرێژەبەرد: قەوزەی سەربەرد، خەنەتیلکە**

**کەڤر:بەرد، گابەرد، بەردی زل**

**کلکەسووتێ:کلکە لەقێ، کلك ڕاتەکاندنی سەگ بۆ کەسێك کە خۆشی دەوێ**

**گارد:پاسەوانی تایبەتی**

**گازی:بانگکردن**

**گەنج:خەزێنەی نەختینە، ماڵی دنیا**

**گەرمەسێر: گەرمیان، شوێنی گەرم**

**گراوی: ماشقە، دلبەر**

**گوڵگەشت:باخچە**

**گۆنگ:ئاڵۆز، مانا نەزانراو، نامەفهووم**

**گیانەسەر:جارز، ناڕەحەت**

**گیانەڵڵاَ:دەمی ئاویلکەدان**

**لاپرەسەن:خۆ تێ هەڵقوتێن، فزوڵی**

**لە پەستاو: بێبڕانەوە، بەردەوام**

**لە ڕای:لە پێناوی**

**لەگەز:مەتەڵ، لیچار**

**لەگینە:لەوانەیە ، ڕەنگە، پێدەچێ**

**لێبڕان:بریاردان، قەراردان**

**لێڕەوار:دارستان، لێڕ، جەنگەڵ**

**لێبۆك:حەنەکچی، فێڵباز،**

**ماش و رنج: مووی ڕەش و سپی**

**ماوا: شوێنی مانەوەو حەسانەوە،شوێن، جێگە**

**مژوول:خەریك، سەرقاڵ، سەرگەرمی**

**مەستیاوەر: مەستی هێن**

**مینا: وەك**

**مامێز:ئاسنێکە لە پاش پانیەی**

**چەکمە قایم دەکرێ،**

نووکی تیژە لە تەڕادی ئەسپ دەدرێ

بۆ لێخورین، مامز

مۆرانە:جانەوەری دارخۆر

منە: گەڕان، تاقیب، سۆراخ

مکووڕ:سوور لەسەر شتان، سەرسەخت

مێریڤان:دلۆڤان، خۆشەویست، میرەبان

میرەبانی: مێریڤانی، میهرەبانی

نازباڵنج:گۆشەی سووک و بچووک، بالیفۆکە

نسیٚ:نسار، سێبەر

نەمازە: خاسما، بە تایبەتی، نەخوازە، نەخازە

نێرەنگ:جادوو، فێڵ و تەڵەکە

نشیمەن: نیشتمان ، شوێنی دانیشن

نیوداشت:نە کۆن و نەتازە

نها:ئیستا، نهوو، هەنووکە

نێش:ژان، ئازار

وچخانە:پاشخان، پەستو، ژووری ئازووقەو کەل و پەلی پێداویستی ماڵ

وشترمر: تەیرێکی گەورەیە ونافڕێ

هەڕاو: گوشاد، گەورە

هەنیە: تەوێڵ، ناوچەوان

هۆڕژن:هاڕەی گریان

هیشک:وشک

هێوەتر:ئەولاتر

هەیڤە شەو:مانگە شەو

هێڤی: هیوا، ئاوات، ئومێد

یۆرغە: ڕەوتی یەک سم

حەمە کەریم عارف

* کەرکووکییە و لە ساڵی 1951دا لەدایك بووە.

- لە ساڵی 1975 کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.

• یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (170) رۆژنامەی هاوکاری لە 1973/6/8 بڵاوبووەتەوە.

- لە ساڵی 1975ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.

- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە 222، گۆڤاری نەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: 222 بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

*لە ساڵی 1974 – 1975دا پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزلوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

- لە هەشتاکانەوە تا 2010/8/20راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.

- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

1- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم 1979
2- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم،1988،چاپی سێیەم 2007
3- بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم 1988
4- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم 2005
5- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك،چاپی یەکەم (1999) دەزگای گوڵان
6- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێڕان چاپی یەکەم 1987 شاخ
7- نینا، رۆمان، سابت رەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،1985 چاپی سێیەم 2005

8- نامۆ، رۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ1987چاپی چوارەم 2009 وەشانخانەی سایە،سلێمانی
9- رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) 1983، چاپی دووەم، 2007
10-شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راه کارگر)، چاپی دووەم، 2009 خانەی وەرگێران.
11- هاوماڵەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم 2000 دەزگای گوڵان
12 – بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم 2006
13- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم 2004 دەزگای شەفەق
14- دووره ولاّت، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم2000 دەزگای گولاّن
15- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: 2008
16- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، 2004 کتێبخانەی سۆران هەولێر
17- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ 1985
18- ئەو رۆژەی کە ونبووم (کۆمەڵە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،2006
19- جیٚ پیٚ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم 2006،نووسەرانی کەرکوك
20- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ1،دەزگای موکریانی
21- چیرۆکستان ،کۆمەڵێك دەقورەخنەی جیهانی چ1 ،2005،نووسەرانی کەرکوك
22-دیدارو دەق و رەخنە،چ2005،1
23-دیداری چیرۆکڤانی، چ2005،1
24-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ2008،1نووسەرانی کەرکوك
25- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ

26- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم 2005
27- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ19981،1
28- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم 2004
29- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم 2006
30- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی شەشەم 2011
31 –کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم 1998
32- چینی کۆن، چ1( )دەزگای موکریانی

33- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی
34- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

35- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر

36- به دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:12)

37- جولەکەکەی ماڵتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.

38- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ

39- بەد حاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.

40- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غوڵام حسەینی ساعیدی)

41- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم 2009، بڵاوەخانەی سایە، سلێمانی

42- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵلائەلبوسێری..

---

43- منداڵە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.

44- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای

45- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان

46- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)

47- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (23ئەفسانە)

---

48- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم2008

49- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (2004) کتێبخانەی سۆران، هەولێر

50- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چ1،دەزگای سەردەم 2009

---

51- گۆڤەنـــد و زنـــار (فەرهـــەنگی فارســـی – کـــوردی) حەمـــە کـــەریم عـــارف، چ1(2006-2008)دەزگای موکریانی

52-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ1، 2001

---

53- چرنیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس

54- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.

55- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.

56- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی

57- گوگول، نووسەری ریالیست

58- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی

59- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی

60- خافروغ لە شیعر دەدویٚ، ژیان و بەرهەمی

---

61- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (2001) دەزگای گوڵان

62-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(1)،2005

---

63- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم2008
64- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم2008
65- مێـژووی ئـەدەبیاتی جیهـان (ئـەدەبیاتی ئینگلیـزی زمـان- ئـەمریکاو ئینگلیسـتان لـە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم2008
66- ریالیزم‌ودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ2004،1،دەزگای سپیرێز
67- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ2006،1دەزگای موکریانی
68- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی
69- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ2، 2006
70- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ1(2005)دەزگای موکریانی
71- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ1،یانەی قەڵەم 2006
72- رێبازە هونەرییەکانی جیهان
73- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ1) 2006
74- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ2007،1
75- دەربارەی رۆمان‌و چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ1، 2008
76- مـەرگی نووسـەرو چـەند باسـێکی دیکـەی ئـەدبی-رۆشـنبیری،حەمەکەریم عـارف،چ1، 2005نووسەرانی کەرکوك
77- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ1) دەزگای موکریانی،2009
78- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()
79- پەڵکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ1، 2004
80- خیانەتی حەلاڵ، حەمە کەریم عارف
81-بووکی هەزار زاوا، کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی
82-ئەبوزەر، د.عەلی شەریعەتی
83-ریوایەت، ڕۆمان، بزورگی عەلەوی
84-وقفات فی رحاب الپقافە الکوردیە، حەمە کەریم عارف
85-هەژاران، ڕۆمان، دوستوفسکی
86-دەیڤد کۆپەرفیلد، (رۆمانی کورتکراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیکنز
87-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس
88-ڤل الصوت و قصص اخری، تقدیم و ترجمە جلال زنگابادی
89-شازادە و گەدا، رۆمان، مارك توین
90-توحفەنمای ئەدەبیاتی جیهانی
91-سفرەی فەقیران   حەمە کەریم عارف
92-باڵندەکەی من    رۆمان، فریبا وفی
93- نامەکانی تولستۆی

94- جەمیلە، رۆمان    جەنگیز ئایتماتۆف
95- حەفتا چیرۆکی چینی بۆ منالانی کورد
96- الرحیل الدامی....تقدیم وترجمە: جلال زنگابادی
97- کلاو سوور... کۆچیرۆك بۆ منداڵان
98- ئەو پیاوەی کە سێبەری خۆی فرۆشت ..رۆمان..شامیسۆ
99- دکتۆر...شانۆنامە...برانسیلاڤ
100- خەیام...زانای شاعیران وشاعیری زانایان /جەلال زەنگابادی
101- دۆزەخی پیرۆز، رۆمان ،برهان شاوی
102- من و نەنکم و ئیلاریون و ئیلیکۆ / رۆمان / نودار دومبادزە

* لە راپەڕینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات وبەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاودەکاتەوە..
* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...